# دەستوور ی زمانی کوردی.



## جیزمی یەکەم.

تەوفیق وەهبی

بەغدا.
المطبعة الحديثة
١٩٣٩

پێشکەشە ،

بەناوی مامۆستام کەرنێل ئدمدلی .

---

# پێشکەوت .

مامۆستام کەرنێل ئەدمۆندس کە لە ساڵی ١٩٢٣ دا دەرزی ئینگلیزی پێ ئەووتیم سەردەمێ ئارەزووی کیردبو کە زمانی کوردی فێر ببێ . چونکە ئەودەمە چاپکراوی تری کوردی نەبو ، لەسەر رۆژنامەی « پێشکەوتین » کە لە زەمانی مێجەر سۆن دا دەرئەچوو دەستمام کیرد بە خوێندین . لە دەرزا کەرنێل ئەدمۆندس بۆ تێ گەیشتینی خۆی هەمیشەوەزیفەی کەلیمە کان، وگەردانی فیعلە کانی لێ ئەپیرسیمەوە . مین لەمانەدا بە تەواوی ناشی بوم ؛ مەجبوور بووم بە لێ وورد بوونەوەیان . پیرسێ کە کەرنێل لە دەستوورالێ ئەکیردیم ئەگەر تێ نەگەیشتایە بۆی تەعریف ئەکیردیم ، منیش لە سەر ئەو تەعریفە وێنەم ئەدۆزیەوە هەتا گەیشتمە پایە یێ کە بیتوانیم جوابی گەلێ پیرسەکانی بدەمەوە .

کەبەم چەشنە دەزمانەم زۆر بوو بە خەیاڵما هات کە دەستوورێکی بیچکۆلەی زمانی کوردی بنووسمەوە . ئەم بیرە هەر ئەوە ندەم خۆش بو کە تێ کەویم؛ هەتا هەلیم کەنێ قوولتیر بو . کە نەختێ پێشکەوتیم ناقۆلانی حەرفەکان زمان لێ گیرێیم . دەمێکی درێژو هێزێکی زۆریم لە بین کەندینی ئەم رێ لێ گرەما بەکار هێنا . دەستوورە کە خۆی لە حەرفەکان باشتیر بو . هەر چیشیم ئەنووسیمەوە بۆ پەسەند کرانی پیشانی کەرنێلیم ئەدا .

مین لەکەسێ ئەچووم کە سووژێکمان دابێتە دەس وهەڵکەندینی بیرێکی قوولیان داوا لێ کیردبێ . یان لە بەکێ ئەچووم کە دارو بەردووێکی زۆریان لە بەر دەم کۆ مەڵ کیردبێت و ووتبێتیان کە « کۆشکێکی گەورە هەیە کە

لە عە نی ئەم دارو پەردووە دوروست کراوە . ئە بێ تۆ هەرخیشتێ ، هەر پارچە تەختە بێ ، هەر بیزمارێ ، بە کورتی، هەر پارچە بێ لەم دارو پەردووە لەچی ژوورێك یان دەرگایان پەنجەرە و دیوارو سەربانکی ئەو کۆشکەدا بە کەڵك هێنراوە، بە بێ ئەوە کە کۆشکەکە بیبینی بدۆزێتەوە . »

بە ڕاستی ئەم کارە بۆمن دەردەسەرێکی گەورە بو . چونکە دەستوورێکی کوردی کە بە کەڵك بێ نەنووسرابو هە تا تۆزێ ڕێم لێ ڕووناك بکاتەوە . هەر تەقەلا بێ بو دام ، هەر بێ خەو بێ بوکێشام ؛ ئێستا ئەم دەستوورەم هێناوەتە مەیدان . من نالێم کە ئەم کارەم بێ قسوورە ، هەڵبەتە قسووری هەیە . بەڵام خاوەنی ئینساف تەماشای گەورەیی کارە کە ئەکا وە لێم نەبوورێ .

لە بیرما نە بو کە جزیم جزیم دەری بێنیم . بەڵام چونکە لەسەر ڕۆیێنیم بۆ لەنیەن ، وتیم ئەوەی لە چاپ دراوە دەری بێنیم بەشکو هە تا ئەگەڕێتەوە بخوینرێتەوە وە کە جیزمەکانی تریم دەر هێنا بۆ خوێنەوارەکان ئاسانتی بیبێ .

تەوفیق وەهبی .

# عوزیر .

چونکە لە چاپ دراندی ئەم کتێبە کوردیە بەم حەرفە تازانەوە بۆ چاپکەرێکی کوردی نەزان کارێکی گران بو لەگەڵ هەموو هونەرێکا کە چاپکەرەکە نواندی دیسانەوە لە هەندێ چەوتی ڕزگار نەبو. ئەمانە گەلێکمان نوختە وحەرفین وە کەمان کەمەن ، تێ گەیشتنمان و دۆزینەوەی ڕاستەکانمان بەئاسانی مومکینە ؛ ئەوا لەمانە هەندێکمان پیشان ئەدەین :

| لاپەرە . | دێر . | چەوت . | ڕاست . |
| --- | --- | --- | --- |
| ١ | ٥ | نوسەن . | نووسەن . |
| ١ | ٢١ | ئەلف . | ئەلف . |
| ٤ | ١٤ | حەرکە . | حەرەکە . |
| ٥ | ١٠ | بون . | بوون . |
| ٧ | ٧ | بێ هەڵ نا گیرێ. | بێ هەڵ نا گیرێ . |
| ٧ | ١٩،١٨ | | پۆر زا ، ئەیکریم . |
| ٨ | ١٦ | ێکما . | ێکمان . |
| ٨ | ١٩ | | وپاش « ی » ی سێیەم . |
| ١٥ | ١٦ | لێکبەر . | یەکجەر . |
| ١٨ | ٨ | واوی . | تەواوی . |
| ٢٢ | ١ | بەرمانەی . | بەبارەی . |
| ٣١ | ١٦ | | شێر . |
| ٤٩ | ٧ | پاش . | پێش . |
| ٨٣ | ٧ | قسەی . | قسە . |

# ئەلف و بێ .

١ . زمان پیشاندانی بیرمانە بە یارمەی کەلیمەوە ، زمان شتێکە ئە بێژرێ و ئە شنو وسرێ .

٢ . قسە کیردین دەر هێنانی هەندێ دەنگە .

٣ . نوسین پیشاندانی ئەم دەنگانەیە بە یارمەی هەندێ ئیشارەتەوە .

٤ . کەلیمە . — بۆ پیشاندانی بیرمان بە یارمەی قسە کیردین ونوو - سینەوە کەلیمە بەکەڵك ئەهێنرێ ، کەلیمە لەدەنگێ یان لە چەند دەنگێ دوروست ئەبێ ؛ وەکو ،

| | | |
|---|---|---|
| با | کەلیمەیێکە | دەنگێکی تێدایە . |
| کیردین | کەلیمەیێکە | چوار دەنگی تێدایە . |
| سەربەرز | کەلیمەیێکە | پێنج دەنگی تێدایە . |

٥ . هیجا . — لە کەلیمەیێکائەو دەنگانەی بە یەکەوە بە جارێ ئەکرێن هیجایێ دو روست ئەکەن ، کەلیمە یێك لەیەك یان لەیەك پتیر هیجا دوروست ئەبێ ؛ وەکو ،

لە «با» دا هیجایێکی یەك دەنگی هەیە .

لە « کیردین » دا دوو هیجا هەیە ؛ هەریەکی لە دوو دەنگ دوروست بوون ..

لە «سەربەرز» دا دوو هیجا هەیە ؛ هیجای یەکەم لە دوو ، هیجای دووەم لە سێ دەنگ دوروست بووە .

٦ . حەرف ئەو ئیشارەتانەن کە بۆ پیشاندانی دەنگ هەڵبەستێراوین ؛ حەرفەکانی زمانێك پێکەوە پێیان ئەڵێن ئەلف و بێ .

# ئەلفوبێی کوردی.

٧ . ئەلف و بێی کوردی لە سەو پێنج حەرف دوروست بووە؛
ئەمانەن :

| شکیلمان | ناومان | شکیلمان | ناومان | شکیلمان | ناومان |
|---|---|---|---|---|---|
| ء | هەمزە | ڕ | ڕێ | ل | لام |
| ب | بێ | ز | زێ | ڵ | ڵام |
| پ | پێ | ژ | ژێ | م | میم |
| ت | تێ | س | سین | ن | نون |
| ت | تێ سووك | ش | شین | و | واو (ئو) |
| ج | جیم | ع | عەین | ه (ە) | هێ (ئە) |
| چ | چیم | غ | غەین | ی | یێ (ئی) |
| ح | حێ | ف | فێ | ێ | ئێ |
| خ | خێ | ڤ | ڤێ | ي | ئي |
| د | دال | ق | قاف | ۆ | ئۆ |
| دِ | دِال | ك | كاف | ا | ئا |
| ر | رێ | گ | گاف | | |

## سینفەکانی حەرف.

٨ . ئەم حەرفانە دوو سینفێن :

١ . حەرفی دەنگی ،

٢ . حەرفی حەرکە .

٩ . حەرفي دەنگي ئەوانەن کە هەر بە کتێکمان بۆدەنگێ دانراوە ، بەلام لە خۆیانەوە دەنگیان لێدەرنایێ ؛ ئەمانەن :

ء ، ب ، پ ، ت ، ث ، ج ، چ ، ح ، خ ، د ، ذ ، ر ، ڕ ، ز ، ژ ، س ، ش ، ع ، غ ، ف ، ڤ ، ق ، ك ، گ ، ل ، ڵ ، م ، ن ، و ، ه ، ی .

١٠ . حەرفي حەرەکە ئەوانەن کە ئەخرێنە پاڵ حەرفە دەنگیەکانەوە بۆ ئەوە کە بەپێی چەشنی ئەو دەنگ کیردنە کە گەرەکە کار بە گەروو وەلنو بکەن ؛ لەبەر ئەمە ئەبێ ئەم دوو سینف حەرفە بۆپێشاندانی دەنگێ پەك بکەوین . حەرفی حەرەکە ئەمانەن :

ا ، و ، ۆ ، ە ، ی ، ێ ، ي

# حەرفی دەنگی .

١١ . حەرفی ح ، ع ، ق لە ئەسلی کوردیا نەهن،لە عارەبی وەرگیراوین؛ عارەبەکان ئەم دەنگانە لە ناو گەرووەوە دەرئەهێنین ؛ لە کوردیا سووکتیر دەرئەهێنرێن .

١٢ . پ ، چ ، ژ ، گ لە هەموو شێوەکانی کوردیا هەن .

١٣ . ث، ذ، ڵ هەندێ شێوەی سلێمانییین ؛ حەرفی «ث، ذ» بۆ سووك کیردني حەرفی « ت ، د » لە پاتیان بەکەڵك ئەهێنرێن ؛ وەکو ، باوکیث لە کوێیە ، ئەم کاغەزە ئەذەم بەو .

١٤ . « ڤ » هەندێ شێوەی سەرووە ، بەلام لە چەند کەلیمەیەکی کوردی سلێمانیشا ئەبینرێ ؛ وەکو ،

ڤرە . حەڤدە .

١٥ . ئەگەر لە کەلیمە یێکا لە عەینی حەرفی دەنگی دوو دەنیك بەك بکەوین دەنگەکە بە هێز ئەکرێ ؛ وەکو ،

خیتتە ، حەسسوٚ ، کەللە .

١٦ . حەرفەدەنگیە کانی ئەلف وبێ هەریەکە بوٚ پیشاندانی دەنگێ دانراوین ؛ بەلام سێ دەنگی کە هەیە کەیە کی لە دوو دەنگ دوروست بوون وە پێیان ئەلێن حەرفی دەنگی لێکدراو ؛ ئەمانەن :

نب ، نگ ، لل ؛ وەکو ،

پەنب ، دەنگ ، هەللا .

« ب ، گ » لێرە دا ئەتوانین جێ بە کتێر بگرین ؛ وەکو ،

دەنگ ، دەنب ، پەنگ ، پەنب .

١٧ . بەم سێ دەنگە لێکدرا وانەوە لە کوردی سالنانداسەوە چوار دەنگ هەیە

# حەرفی حەرکە .

١٨ . حەرفی حەرەکە ناسراون وە بە پێی دوروست بوونیانەوە دوو چەشنین :

١ . حەرەکەی رووت .

٢ . حەرەکەی لێکدراو .

١٩ . حەرەکەی رووت ئەم حە و ت حەرفەی خوارە وەن کە لە پێشاله ئەلف وبێ دا پیشانمانیا بوون :

| شکیلیان | ناوبان | وێنه | |
|---|---|---|---|
| ا | ئا | ساوا | حەرەکە نێکی درێژە . |
| و | ئو | کورد | حەرەکە نێکی کورتە . |
| وَ | ئوَ | پوَر | حەرەکە نێکی درێژە . |
| ە | ئە | حەمە | حەرەکە نێکی کورتە . |
| ی | ئی | سەروان | حەرەکە نێکی کورتە : |
| ێ | ئێ | دێر | حەرەکە نێکی درێژە . |
| ي | ئي | کیردین | حەرەکە نێکی کورتە |

٢٠ . حەرەکەی لێکدراو لە بەکبانی دوو حەرەکەی ڕووت دو روست بونەوە چوارین :

| شکیلیان | ناوبان | وێنە | |
|---|---|---|---|
| وو | ئوو | دوور | حەرەکە نێکی درێژە |
| ێ | ئێ | شێر | حەرەکە نێکی درێژە |
| وي | ئوي | گویز | حەرەکە نێکی درێژە |
| یو | ئیو | دیور (٠) | حەرەکە نێکی درێژە |

٢١ . حەرفە حەرەکەکان هەر چەندە ناوبان وەکو لە سەرەوە پیشاندراوە وا نە بەلام دەمێ وا ئەخوێنرێنەوە کە حەرفی ئەداتێ بێن کە بەکەلمە نێکە وە نە نووسابێ ؛ وەکو ،

« ان » ی ئەداتی گەل و « ەکەی » ئەداتی تە عریفی ەەعەەن بە تە نمابێن « ئان ، ئەکە » ئەخوێنرێنەوە .

---

(٠) بەشێوەی کوردیستانی خوَر هەلات بەعنی دوور .

٢٢ . لە کەلیمەدنکا چەند حەرەکە بیبێ ئەوەندە هجای تماثەبێ ؛ وەکو ،

لە کەلیمەی « کەلانتەر » دا سێ هجا هەیە ؛ چونکە حەرەکەی « ە ، ا ، ە » ی تیایە .

٢٣ . ئەگەر هجایێك هەر دەنگێکی تیابێ حەرەکەکەی ئەبێ لە دوایە وەبێ ؛ وەکو ،

کامە ، کاهوو ، ئە ، ئا

٢٤ . حەرەکە بێ ئە توانرێ دوو دەنگی پێ بخوێنرێتەوە ؛ وەکو ،

دیز ، بار ، بەر ، پوولە .

٢٥ . حەرەکە بێ ئە توانرێ سێ دەنگی پێ بخوێنرێتەوە ؛ وەکو ،

بەرد ، کەوت ، گۆشت .

٢٦ لەهجایێکدا لە سێ دەنگ پتیر نابێ .

٢٧ . حەرەکە کان بەپێی کاریانەوە دوو سینفین :

١ . حەرەکەی پەتی .

٢ . حەرەکەی دوو روو .

## حەرکەی پەتی .

٢٨ . حەرەکەی پەتی ئەم چوارەی خوارەوەن کە لە حەرەکە زیاتیر بە هیچ نابین :

ا ، ۆ ، ێ ، ، ي .

٢٩ . لەمانە حەرکەی « ي » ئە شێ هەڵ بگەڕێ لە ناو دوو دە نگدا ، ئەگەر دە نگەکەی دواییان حەرەکەیەکی لە پاشەوە بێ ؛ وە کو ،

دە نیك ، ئەم دە نیکە یان ئەم دە نکە .

ئا سین ئەم ئاسینە یان ئەم ئاسنە .

فەعیل ئەم فەعیلە یان ئەم فەعلە .

٣٠ بەلام ئە گەر دە نگەکەی دواوەی حەرفێکی کەی لەدواوە نەبێ، یان دە نگێکی کەی لە دواوە بێ هەڵ نا گەڕێ ؛ وە کو ،

دەنیك ، پزیشك [ ٭ ] ، کیردین .

٣١ . «ي» ی «بي» ی ئەداتی سەمغەی ئینشای لە پێش « ي » یا « یان » ی بۆ ناوا ئەبێتە «ی» ی حەرکە ؛ وە کو ،

بي خۆ ، بی خۆ ، بیان خۆ .

## حەرەکەی دوو روو .

٣٢ . حەرکەی دوو روو بێجگە لە حەرەکە بە تەمە کان ئەوانی ترین کەلە چاو ئەو حەر فانەی لە کەلمە دا ئەم لاو ئەو لایان ئە گرین گا ئەبینە حەرەکە وگا ئەبنە دەنگی .

٣٣ . حەرەکەی « ە ، و ، ی » ئەگەر لە لایەکمانەوە بەکێ لە حەرەکە بە تەمەکان بێت ئە بنە دەنگی ؛ وەکو ،

ڤەئۆك ، هاوار ، گەوهەر ،

واوە . ناوئێریم .

گێرفان ، گێردی گۆپالە .

---

[ پزیشك ] یەعنی دوقتور .

٣٤ . ئەگەر حەرفی «ە ، و ، ی» دوانیان یان هەر سێکیان لای یەکەوە بێن بە پێی بوونی حەرەکە یێك لە پێشیانەوە یان لە پاشیانەوە ئەوەی ئەو لایە یان ئە بێ بە دەنگی یان بە حەرەکە .

ئەمجابەپێی ئەوە همنە کانتیر حەرەکە یان دەنگی بوونیان مە علووم ئە کا § ٣٣ ؛ وەکو ،

کەلهوڕ ، ئەهرام ، نایوچەنگ ، سەروی خەرامان .

٣٥ . حەرەکەی لێکبراوی « وو ، یی » لە ناو دوو دەنگسایێن حەرەکەن ؛ وەکو ، کەرکووك ، سەرهێن .

٣٦ . ئەگەر ئەم حەرەکانە لە هەر لایێکیانەوە حەرەکەیێ بێت «ی» یان « و » وەکەی ئەو لا یان ئە بێتە دەنگی ؛ وەکو ،

جیاووك ، پاییز ، کەرکووکسەکە .

٣٧ . ئەگەر حەرەکەی « وو ، یی » لە هەر دوو لایانەوە حەرەکە بیبێت هەردوو « و ، ی » بە کەئە بنە دەنگی ؛ وەکو ،

حەووا ، مەییان .

٣٨ . ئەگەرسێ « ی » یەك بکەوین وحەرفی پێش « ی » ی یەکەم دەنگی بێ « ی » یێکیا فڕێ ئەدرێ ؛ وەکو ،

لە یاتی « ئەوان تاجیی یان نیە »

« ئەوان تاجیان نیە » ئەنووسرێ .

٣٩ . ئەگەر حەرفی پێش « ی » ی یەکەم حەرەکە بێ هەر سێ « ی » یەکە ئە مێننەوە ؛ وەکو ،

دوایی ، دوایییان

٤٠ . ئەگەر دوو « ە » لای یەکەوە بێن هەرکامێکیان حەرەکە نێکی لە لاوە بێت، ئەوە ئەبێتە دەنگی و ئەوێکەیان ئەبێتە حەرەکە؛ وەکو،

بەهار ، گەوهەر ، لە هەڵمانەکە .

٤١ . حەرەکەی لێکبڕاوی « وي » ئەگەر لە پێشەوە حەرفێکی دەنگی بێت حەرەکەیە ؛ وەکو،

کویز ، سوي .

٤٢ . ئەگەر لە پێشەوە هیچ حەرفێ نە بێت یان حەرەکە بێ بێت «و»وەکە ئەبێتە دەنگی §٣٣ وە «ي» یەکە بە حەرەکە بی ئەمێنێتەوە؛ وەکو،

ویس ، ئاویس ، کاویژ ، مێویژ ، ویلانە .

٤٣ . حەرەکەی لێکبڕاوی « یو » ئەگەر لە دیوایەوە هیچ حەرفێ نە بێت یان حەرفێکی دەنگی بێت حەرەکەیە ؛ وەکو،

دیور ( بە شێوەی ڕۆژهەڵات بەعنی دوور . )

٤٤ . ئەگەر لە دیوایەوە حەرەکە بێ بێت «و »وەکەئە بێتە دەنگی وە « ي » ەکە بەحەرەکە بی ئەمێنێتەوە؛ وەئە مجاهە لـگیر تێنێشی ئەبێ § ٢٩ وەکو،

چیوار ، چوار . شیوان ، شوان .

# ئیختسار .

٤٥ . ئیختسار نووساندینی دوو کەلیمەیە بە یەکەوە .

٤٦ . ئەگەر حەرفی دوایی کەلیمەی یەکەم دەنگی و حەرفی یەکەمی کەلیمەی دووەم هەمزە بێ هەندێ جار ئەم هەمزەیە هەڵ

ئه‌گیرێ و حه‌ره‌که‌که‌ی ئه‌بڕێ له‌ ده‌نگه‌ که‌ی که‌لیمه‌ی یه‌که‌م ؛ وه‌کو ، سه‌رنشه‌ له‌باتی سه‌رنشه‌ .

٤٧ . ئه‌داتی ته‌واوی « ئه‌ » هه‌میشه‌ ئه‌نرێ به‌ دیوا حه‌رفی فیعله‌وه‌، به‌لام ئه‌گه‌ر دیوا حه‌رفی فیعله‌ که‌ حه‌ره‌که‌ بێ هه‌مزه‌که‌ ئه‌گۆڕدرێ به‌ « ت » ، له‌ ئه‌مرا له‌ باتی « ت » « ر » به‌ که‌لك ئه‌هێنرێ ؛ وه‌کو ،

| | | |
|---|---|---|
| ئه‌ چمه‌ ماڵه‌ وه‌ | له‌ باتی | ئه‌ چیم ئه‌ ماڵه‌ وه‌ |
| چووه‌ته‌ ماڵه‌ وه‌ | له‌ باتی | چووه‌ ئه‌ ماڵه‌ وه‌ |
| بچۆره‌ ماڵه‌ وه‌ | له‌ باتی | بچۆ ئه‌ ماڵه‌ وه‌ |

٤٨ . ئه‌گه‌ر حه‌رفی دوای که‌لیمه‌ی یه‌که‌م حه‌ره‌که‌ی « ه‌ » بێ هه‌ندێ جار وه‌ به‌تایبه‌تی له‌ ئه‌داتی ته‌واوی « له‌ ، به‌ » دا ئه‌م « ه‌ » ـ یه‌ و هه‌مزه‌که‌ی که‌لیمه‌ی دووه‌م هه‌ڵ ئه‌گیرێن ؛ وه‌کو ،

| | | |
|---|---|---|
| حه‌ماغا | له‌ باتی | حه‌مه‌ ئاغا |
| لێوه‌ | له‌ باتی | له‌ ئێوه‌ |
| به‌ مانه‌ | له‌ باتی | به‌ ئه‌مانه‌ |



# جومله

٤٩ . جومله بەیان کیردینی حوکمێکه ؛ وەکو ،

ئاگیر ئه سووتێ •

باڵه کوێوه بێ .

دەفتەرەکه بێنه •

سلێمانی شارێکی خۆشه وسێق کوردیستانه •

ئەمانەی سەرەوه جوملەن ؛ چونکه هەر یەکی حوکمێ بەیان ئەکەن . هەندێ لەم جوملانه کورتین و هەندێکیان درێژین ؛ چونکه هەندێکیان بیرێکی کورت وهەندێکیان بیرێکی درێژ پیشان ئەدەن •

٥٠ . جومله یان بەیانی ، یان پیرسی ، یان فەرمانی ئه بێ :

١ . جوملەی بەیانی ئەوانەن که شتێ بەیان ئەکەن ؛ وەکو ،

مین ئه چیمه سابلاخ .

بیرە مەگروون بەرزه .

٢ . جوملەی پیرسی ئەوانەن که پیرسێ ئەکەن ؛ وەکو ،

بۆ ناچیمه سابلاخ ؟

ئایا تۆ ئەم ئێوارێنه له ماڵەوە ئه بی ؟

٣ . جوملەی فەرمانی ئەوانەن که فەرمان دائه دەن یان ئه پارێنه وه ، وەکو ،

دەرگاکەم لێ بکه رەوه .

# کەرتەکانی جوملە .

٥١ . جوملە نێك — کورت بێ درێژ بێ — لە دوو کەرت دوروست ئەبێ :

١ . باس لێکراو

٢ . باس

٥٢ . باس لێکراو لە جوملە نێکا ئەو کەلیمــــەیەیە کە ناوی ئەوکەســەمان ئەو شیتە ئەبا کە لێی ئەدوێن ؛ وەکو ،

بەفیر ئەبارێ

هەوردەکە ساردە .

لەم جوملانەدا کەلیمەی بەفیر ، هەوردەکە باس لێکراوین .

٥٣ . باس لێکراو ئەبێ ناوبێ یان کەلیمەیێ بێ کە لە باتی ناوبەکاڵك هێنرابێ ؛ ئەوکەلیمەیەی لەباتی ناو بەکاڵك ئەهێنرێ پێی ئەلێن بۆناو ؛ وەکو ،

منالەکان رۆین ، ئەوان رۆین .

٥٤ . باس لە جوملە نێکا ئەوکەرتەیەکە ئەو خەبەرە پیشان ئەدا کە لە حەق باس لێکراو ئەدرێ ؛ وەکو ،

بەفیر ئەبارێ .

هەوردەکە ساردە .

لەم جوملانەدا « بەفیر » ، «هەوردەکە » باس لێکراوین ، « ئەبارێ» ، «ساردە» باسین .

٥٥ . ئەگەر باس هەر لە کەلیمە بێ دوروست بووبێ ئەم کەلیمە بە بێ ئەلێن فەعیل ؛ وەکو ،

مین ئەخوینیم .

٥٦ . ئەگەر باس لە چەند کەلیمە بێ دوروست بوو بێ ئەو کەلیمە ەی لە باس لێنکراو ئەدوێ فعلە ، ئەوانێتر بۆ تەواو کیردینی مەعنای ئەو لێی کۆ بوونەوە ؛ وەکو ،

بایەکە ئەمرۆ لیق و پۆپی دار توەکە ئەشکێنێتەوە .

لەم جوملە یە دا —

«بایەکە» باس لێکراوە ،

« ئەمرۆ لیق و پۆپی دار توەکە ئەشکێنێتەوە » باسە .

« ئەشکێنێتەوە » فعلە .

٥٧ . باس لێکرا وێش ئەتوانێ لە چەند کەلیمە بێ دوروست بیبێ : کەلیمە زیادەکان تەواو کەری ئەبین ؛ وەکو ،

ئەمرۆ بایێکی زۆر توند دارەکە ئەشکێنێتەوە . لەم جوملە یە دا —

بایێکی زۆر توند باس لێکراوە ،

با ناوە ، باس لێکراوە ،

ێکی زۆر توند بۆ تەواو کیردینی مەعنای هاتوونە پالی .

٥٨ . فەعیل ناووکی جوملە یە ، حەتتا فعلێکی گەردان کراوی کەسدار سەربەخۆ جوملە ێکە ؛ چونکە حوکمێ بە یان ئەکا ؛ وەکو ،

مین ئەرۆم .

ئەرۆم .

وێنەی یەکەم جوملە یە؛ چونکە —

« مین باس لێکراوە ، »

« نەرۆم » باسە .

وێنەی دووەمیش جوملەیە ؛ چونکە ئەویش حوکمێک بەیان ئەکا ؛ لەمەدا کاری باس لێکراوی بۆ ناوی « م » ئەی بدمنێ .

## باسی ناتەواو.

٥٩ . فعلی « بوون »ی ناتەواو باسێکە کە هەمیشە بە یارمەتی کەلیمەیێکی تیرە وە حوکمێ بەیان ئەکا ؛ لەبەر ئەمە پێی ئەلێن باسی ناتەواو ؛ وەکو ،

سنە شارە .

لەم جوملەیەدا —

| | |
|---|---|
| سنە | باس لێکراوە، |
| شارە | باسە ، |
| ە | باسی ناتەواوە ، « شار » تەواوکەریەتی . |

# پارچه كانى قسه .

٦٠ . له‌جومله یێكا هه‌ر كه‌لیمه یێك كارێكى تايبه‌تى هه‌يه ؛ وه‌كو ،

منال ده‌فته‌ر له‌سه‌ر مێزى سه‌وز دائه‌نێ .

له‌م جومله‌يه‌دا «منال ، ده‌فته‌ر ، مێز» ناوين ، «دائه‌نێ» حه‌ره‌كه‌تێ باس ئه‌كا ، پێمان ئه‌ڵێ كه‌منال چى ئه‌كا ؛ له‌به‌ر ئه‌وه فعله ، «سه‌وز» مه‌عناى كه‌لیمه‌ى «مێز» ته‌واو ئه‌كا ، پيشانمان ئه‌دا كه مێزێكى تايبه‌تى ميرادێ كراوه ؛ له‌به‌ر ئه‌وه سفه‌ته‌تى ، «له‌سه‌ر» موناسه‌به‌تى مه‌يانى مێزوفعلى «دائه‌نێ» پيشان ئه‌دا ؛ ئه‌بينرێ كه هه‌ريه‌كێ له‌م كه‌ليمانه له جومله دا كارێكى تايبه‌تى خوى هه‌يه .

ئه‌مجا ئه‌گه‌ر بێت و هه‌موو كه‌ليمه كانى زمانێك به‌پێى ئه‌و كاره تايبه‌تيانه‌وه كه‌له جومله دا ئه‌يان بينين جوێ بيكرێنه‌وه ئه‌بينرێ كه هه‌شت سينف كه‌ليمه هه‌يه ؛ ئه‌مانه پێ يان ئه‌ڵێن پارچه كانى قسه ، وه‌وا له‌ژێره‌وه پيشانديراوين :

| | |
|---|---|
| ١. ناو | ٥. ئه‌داتى ته‌واوى |
| ٢. سفه‌ت | ٦. زه‌رف |
| ٣. بوناو | ٧. ئه‌داتى لێكدانى كه‌ليمه |
| ٤. فعيل | ٨. نيدا . |

٦١ . ناو كه‌ليمه يێكه كه بو ناو نانێ كه‌سێ يان شتێك به‌كه‌لك ئه‌هێنرێ ، وه‌كو ،

خوله له باخه‌كه‌دا مارێكى كوشت

لە م جوملە یە دا « خولە » ناوی کە سێکە ، « مار » ناوی شتێکە (گیانداریک) ، « باخ » ناوی شتێکە ( جێ یێک ) .

ئە بێ بزانین کە ناوی کە سە کە مان شتە کە ناوە ؛ ئە گە نا کە سە کە مان شتە کە خۆی ناو نیە . لە وێنە کەی سەر ووەدا «خولە ، باخ ، مار » خۆ یان ناو نین ؛ بە ڵام کەلیمە کانی «خولە ، باخ ، مار» کە بو ناوەکانی ئە و کە س و جێگاو گیاندارە دانراوین ناوین .

٦٢ . سفەت کەلیمە یێکە کە بو ئە واو کیردینی مەعنای ناو مان بو ناو بە کە ڵک ئە هێنرێ ؛ وە کو ،

پیاوێکی شە ل دوو داری لە بره ێکیلا بو .

لێرەدا کەلیمە ی « شە ل » سفەتە چونکە چۆنی پیاوێک پیشان ئە دا ، کەلیمەی « دوو » ش سفەتە چونکە سینووری مەعنای «دار» پیشان ئە دا .

٦٣ . بۆ ناو کەلیمە یێکە کە لە باتی ناوێ کە لە پێشا ووترابێ یان لە بیەرابێ بە کە ڵک ئە هێنرێ بۆ ئەوە کە ئە و ناوە دوو بارە نە کرێتەوە ؛ وە کو ،

خۆلە بۆ کوێ چوو ؟ مین بە ئە وم ووت کە چە قۆکە تیژە ، دە ستی ئە برێ .

لە م جوملە یە دا «مین» بۆ ناوە، لە باتی قسە کەر ، «ئە و ، ی» بۆ ناوین ، لە باتی « خولە » بە کە ڵک هێنراوین .

٦٤ . فیعیل کەلیمە یێکە کە کار وحالی کەسێ یان شتێک لە دە ربێکا باس ئە کا ؛ وە کو ،

کا کیم نان ئە خوا . میوانە کە دانیشتووە .

# فعلی گەردان کراوی کەسدار .

٦٥ . فعلی گەردان کراوی کەسدار ئەو سیغانەن کە بیتوانین لە پێشانەوە بکێن لە بۆناوە کەسیە کانی « مین ، تۆ ، ئەو ، ئێمە ، ئێوە ، ئەوان » کە ئەبنە باسلێکراو وەرگرین . فعیل دەمێ ئەبێتە باس کە بکێ لەو چەشنە سیغانە بێ ؛ وەکو ،

ئەنووسیم ، نووسیتان .

ئەمانە فعلی گەردان کراوی کەسدارن ؛ چونکە ئەتوانین بلێین « مین ئەنووسیم ، ئێوە نووسیتان . » زانەن بۆناوە پێوە نووساوەکانی « یم ، تان » بۆ پیشاندانی باسی ئەمانە کافیە .

٦٦ . سیغەی مەسدەر و دوولا نی نابنەباس ، چونکە ناتوانرێ بۆناوێکی کەسی بخرێتە پێشیانەوە ؛ وەکو ،

نووسین ، نووس ؛ نووساو ، نووسراو .

ناتوانین بلێین « ئێمە نووسین ، تۆ نووسراو . . . هتد . »

٦٧ . فعلی « بوون » گە لێ جار فعلێکی ناتەواوە وە ئەبێتە واسطە بۆ ووتینی شتێك لەحەق کەسێ یان شتێکا . لەبەرئەوە پێی ئەلێن باسی ناتەواو § ٥٩ ؛ وەکو ،

حەلوا کە شیرین بو .

لەم جوملەیەدا سفەتی « شیرین » بە یارمەی فعلی « بو » وەوەمەعنای باسلێکراوی « حەلوا کە » ی تەواو کیردووە .

٦٨ . زەرف کەلمە یێکە کە بۆ تەواو کیردنی مەعنای فعلێ یان سفەتێ یان زەرفێکیتر بە کە لك ئەهێنرێ . سفەتێ چۆن مەعنای ناوێ

تەواو ئەکا ئەمیش هی سفەت و فعیل و زەرف وا تەواو ئەکا ؛ وەکو ،

ئەو زۆر ئەنوێ .

لێرەدا « زۆر » زەرفە ؛ فعلی « ئەنوێ » تەواو ئەکا .

بەفرێکی زۆر ئەستوور باری .

لێرەدا « زۆر » زەرفە ؛ سفەتی « ئەستوور » تەواو ئەکا .

ئەو زۆر خێرا ڕوی .

لێرەدا « زۆر » زەرفە ؛ زەرفی « خێرا » تەواو ئەکا .

**٦٩ . ئەداتی تەواوی** کەلیمە یێکە کە لە جوملە یێکا بۆ پیشاندانی لاقە ی مەعانی ناوێ ، سفەتێك و کەلیمە یێکیتر بە کەلك ئەهێنرێ ؛ وەکو ،

ئێمە لەمەرگەوە هاتین .

پیاوەکەی تۆش ڕۆی .

جامانە سەرپۆشێکی ناقۆلا یە .

لەجوملەی یەکەما ئەداتی تەواوی « لە . . . وە » لاقە ی مەعانی فعلی « هاتین » و ناوی « مەرگە » ، لە هی دووەما « ی » لاقەی مەعانی ناوی « پیاوەکە » و بۆناوی « تۆ » ، لە هی سێیەما ئەداتی تەواوی «ی» لاقەی مەعانی ناوی « سەرپۆشێك » و سفەتی « ناقۆلا » پیشان ئەدا . ناوی « مەرگە » ، بۆناوی « تۆ » ، سفەتی « ناقۆلا » مەعنای فعلی « هاتین » ، ناوی « پیاو » ، ناوی « سەرپۆشێك » تەواو ئەکەن . لەبەر ئەمە بەم ئەداتانە ی لاقەی مەعانی ئەمانەیان پیشاندراوە ئە لێن ئەداتی تەواوی .

٧٠ . ئەداتی یەکخەر ئەداتێکە کە دوو کەلیمە یان دوو کۆمەڵە کەلیمە بەیەکەوە ئەبەستێ ؛ وەکو ،

بەفر و باران پێکەوە باریین .

سەربانی ماڵی ئێوە و چنارەکەی مەکتەب لە دوورەوە دیارین .

مین لێرەم بەڵام گوڵچین لە ماڵەوەیە .

لە جوملەی یەکەما ئەداتی یەکخەری « و » دوو ناوی ، لە دووەما ئەداتی یەکخەری « و » دوو کۆمەڵە کەلیمەی ، لەسێیەما ئەداتی یەکخەری « بەڵام » دەسانەوە دوو کۆمەڵە کەلیمەی پێکەوە نووساندبووە .

٧١ . ئەداتی نیدا دەنگێکە کە بۆ پیشاندانی حەستێکی وەکو خۆشی ، عاجباتی ، پژارە ، تیرس . . هتد . بەکەڵك ئەهێنرێ ، ئەمانە لەگەڵ کەلیمەکانیتری جوملەدا لاقەیێکیان نابێ ؛ وەکو ،

ئای ! لەبیریم چو .

ئۆخەی ! ریزگار بووم .

ئۆف ! لەدەس تۆ وەختە شێت بیم .

لەم جوملانەدا « ئای ! » بۆ عاجباتی ، « ئۆخەی ! » بۆخۆشی ، « ئۆف ! » بۆ پژارە بەکەڵك هێنراوین .

# تەواو کیردین .
# کەلیمەی تەواوکراو .

٧٢ . بەکەڵك هێنانی هەندێ لەپارچە کانی قسە بە پێی پێویستەوە لەجوملەدا بۆ مەعەن کیردین و برینە وەی سنووری مەعنـــای هەندێکیتیر یان پێی ئەڵێن تەواو کیردین .

٧٣ . ئەو پارچانەی مەعنای پارچەکا نیتیریان تەواوکیردووە پێیان ئەڵێن تەواو کەر وە ئەو پارچانەی مەعنایان تەواو کراوە پێ یان ئەڵێن تەواو کراو.

٧٤ . وەکو لە § ٥١ دا ووتوویان ئەساسی جوملە باسلێکراو و باسە : یەعنی ناو و فیعلە ، کەلیمە کانیتیر بۆ تەواو کیردنی مەعنای ئەمانە ئە چینە جوملەوە .

## تەواو کرانی ناو و بۆناو .

٧٥ . تەواو کەری ناو یان بۆناو ئەمانەن :

ناو ، سفەت ، بۆناو ؛ وەکو ،

١ـ دەرگای باخ .

٢ـ دەرگای سەوز .

٣ـ ئەم دەرگایە .

لەوێنەی یەکەما تەواو کەری ناوی « دەرگا » ناوە ، لەهی دووەما تەواوکەرەکەی سفەتە ، لە سێ یەما دیسانەوە سفەتە وەز سفەی هەرسێکیان تەعەین کیردین و برینەوی سنووری مەعنای دەرگاکەیە ، چونکە هەر

یان ووتا یه « دەرگا » مەعنا کەی زۆر ناتەواو وزۆر بلاو ئە بو ، هەموو دەرگای دینامان بەعەقلا ئەهات . بەلام بە هێنانی ئەمانە لە «دەرگای باخ» لە « دەرگای سەوز » وە لە « ئەم دەرگایە » پیتیر هیچ نەوعە دەرگا ێکمان بە بیرا نایەت . لەوێنە کانی

دەرگای ئێوە .

ئەوەی مین ... دا

بۆ ناوی « ئێوە » تەواو کەری « دەرگا » یە وە بۆ ناوی « مین » تەواو کەری بۆ ناوی « ئەوە » یە .

٧٦ . تەواوکەرە کانی ناو یان بۆ ناو بە یارەی ئەداتی تەواوی « ی » یان یەکێ لە لێکدراوە کانە وەکە وەکو ، « ی سەر ، ی ناو ... هتد . » ێن کاری خۆیان ئەبینین ؛ وەکو ،

گوڵی سوور .

گوڵی ناو باخ .

ئەوەی سەرمێزەکە .

بەلام هەندێ لە سفەتە کان بە بێ ئەداتی « ی » ناو تەواو ئەکەن ، ئەمانە لەجێگەی خۆیانە باسمان ئەکەین .

٧٧ تەواوکەری باسی ناتەواو § ٦٧ تەواو کەری باسلێکراوەکەیەتی . لە بەر ئەمە باسی ناتەواو باسی لێکدەر ێی پێ ئەڵێن ؛ وەکو ،

پاوانەکە زێڕە .

پیرۆز نەخۆش بو .

لەم دوو جوملەیەدا هەرچەندە ناوی « زێڕ » و سفەتی « نە خۆش »

تەواوکەری باسی ناتەواوین ، تەواوکەری باسلێکراوەکانشمانین ؛ بەرابەی فعلی « ە ، بو » وەوە باسلێکراوەکانیان تەواو کیردووە .

## تەواوکرانی فعیل .

٧٨ تەواوکەری فعیل ناو ، بۆناو ، زەرف ئەبێ ؛ وەکو ،

تۆ کاغەزێکیت نارد .

تۆ کاغەزێکیت بە پۆستەدا نارد .

منالەکە لە هەیوان نوست

ئەم منالە زۆر نوست .

لە وێنەی یەکاما ناوی « کاغەز » فعلی « ناردیت » ی تەواو کیردووە، چونکە ئەم ناوەمان نەووتایە نەمان ئەزانی چی نێرراوە . ئەم چەشنە تەواوکەرانە پێیان ئەڵێن **تەواوکەری سەربەخۆ** ، لەبەر ئەمەکە بێ ئەداتی تەواوی کاری خۆیان ئەبینن .

لەوێنەی دووەما بێجگەلە تەواوکەری « کاغەزێك » ناوی «پۆستە»ـش هەیە کە ئەمیش تەواوکەری فعلی « ناردیت » ە . چونکەبە هاتینی ئەمە دیار بووەکە فعلی « ناردیت » بە چی واستەیکا کراوە . بەلام ئەم تەواوکەرە وەکو ئەوتیر راستەوخۆ مەعنای فعلەکەی تەواو نەکیردووە ؛ بە یاریەی ئەداتی تەواوی « بە . دا » وە کاری خۆی کیردووە . ئەم جۆرە تەواوکەرانەش پێیان ئەڵێن **تەواوکەری بە یاریە** .

لەوێنەی سێیەما « هەیوان » فعلی « نوست » ی تەواو کیرددوە ، وەچونکە کاری خۆی بەیاریەی ئەداتی تەواوی « لە » وە بەمنەوە ئەمیش تەواوکەری بەیاریەیە .

لەوێنەی چوارەما زەرفی « زۆر » مەعنای فیعلی « نوست » ی تەواو کردووە. ئەگەر ئەم کەلیمەیە نەبوایە نەمان ئەزانی کە ئەم منالەچەند نووستووە.

٧٩ . تەواوکەری باسی ناتەواو سفەتیش ئەبێ ؛ وەکو ،

منالەکە نەخۆشە .

لەم جوملەیەدا سفەتی « نەخۆش » تەواوکەری باسی ناتەواوی فیعلی « ە » یە، بەڵام باسلێکراوی « منالەکە » ش تەواو ئەکا § ٧٧ .

٨٠ . ئەم بەسەرێ کە بنجگە لەهی باسی ؛ تەواو تەواوکەرەکانی فیعیل سێ چەشنین : تەواوکەری سەر بەخۆ ، تەواوکەری بەاربە ، زەرف .

## تەواوکرانی تەواوکەر .

٨١ . تەواوکەرێکیش مومکینە بە کەلیمە یێکیتر تەواو بکرێ .

٨٢ . ئەگەر تەواوکەرەکە ناوبێ ، وەکو ئەی زانیەن ، بەناویان بۆناو . یان بەسفەت تەواو ئەکرێ ؛ وەکو ،

برای باوکی منالەکە نانی ئەخوا : — تەواوکەری باسلێکراو بەناو تەواو کراوە .

کوڕی پیاوێکی شەل نان ئەخوا : — تەواوکەری باسلێکراو بەسفەت تەواوکراوە .

منالەکان نانی تۆ ئەخۆن : — تەواوکەری سەر بەخۆ بە بۆناو تەواو کراوە .

منالەکان نانی سپی ئەخۆن : — تەواوکەری سەربەخۆ بەسفەت تەواو کراوە .

مناڵه‌که له‌گه‌ڵ پشدله‌که‌ی مه‌نسچ ئه‌خوا : — ته‌واوکه‌ری به‌ناربه
به‌ناو ته‌واو کراوه .
مناڵه‌که له‌گه‌ڵ پشدله‌ی ره‌ش ئه‌خوا : — ته‌واوکه‌ری به‌ ناربه
به‌سفه‌ت ته‌واو کراوه .

٨٣ . سفه‌تی ته‌واوکه‌ر به‌سفه‌تێکستیر بان به‌زه‌رف ته‌واو ئه‌کرێ سفه‌تی ته‌واوکه‌ری سفه‌ت ئه‌که‌وێته دوابه‌وه وه به ئه‌داتی ته‌واوی « ی » پێوه ئه‌نووسێ. به‌ڵام زه‌رف پێش سفه‌ت ئه‌که‌وێ وه‌هیچ ئه‌داتێکیان له به‌ینا نه‌؛ وه‌کو ،

کاره‌که‌ره‌که کراسێکی سووری کاڵی له به‌رابو .
مناره‌یێکی زۆر به‌رز رووخا .

له جومله‌ی یه‌که‌ما سفه‌تی « کاڵ » ته‌واوکه‌ری سفه‌تی «سوور» ه .
له‌دووه‌ما زه‌رفی « زۆر » ته‌واوکه‌ری سفه‌تی « به‌رز » ه .

٨٤ . زه‌رف به زه‌رف ته‌واو ئه‌کرێ ؛ وه‌کو ،

مناره به‌رزه‌که زۆر زوو رووخا .

لێره‌دا زه‌رفی « زۆر » ته‌واوکه‌ری زه‌رفی « زوو » ه .

٨٥ . ئه‌و که‌لیمه‌یه‌ی ئه‌داتی ته‌واوی کاری تێ ئه‌کا پێشی ئه‌لێن ته‌واوکه‌ری ئه‌داتی ته‌واوی ؛ وه‌کو ،

گه‌نیم ی قه‌ندبه‌هار . ( گه‌نیمی قه‌نده‌هار . )
ده‌فته‌ره‌که له دۆلابه‌که‌دا دانراوه .

له وێنـه ی یه‌که‌ما « قه‌ندبه‌هـار » ته واوکه‌ری ئه‌داتی ته‌واوی « ی » یه .

لە دووەما « دوَلا بە کە » تەواو کەری ئەداتی تەواوی « لە ... دا » یە ، وە بەخوَی وئەم ئەداتی تەواو یەرە تەواو کەری بەناربەی فعلی «دازاوە» یە.

## تەواو کرانی مەسدەر.

٨٦ . مەسدەر سیغەیێکی فعلە کە خاسەی ناوشی هەیە. ئەم سیغەیە کەسدار نیە ؛ یەعنی ناتوانێ لەپێشەوە یەکێ لە بوَ ناوە کەسیەکان کە نە بینە باسلێکراو وەرگرێ § ٦٦ ؛ وەکو ،

نووسرانی کاغەزەکە زوَری کێشا .

لێرەدا « نووسران » هەم ناوە ، هەم فعلە . ناوە ؛ چونکە باسلێکراوی جوملەکە یە وە « کاغەزەکە » تەواو کەریەتی ، فعلە ؛ چونکە کارێ بەیان ئەکا .

٨٧ . تەواو کەرەکانی مەسدەر هەم وەکو تەواو کەرەکانی ناوین ، هەم وەکو تەواو کەرەکانی فعلین ؛ وەکو ،

نووسینی توَ .

کاغەز نووسین .

نووسینی خێرا .

خێرا روَیین .

بەدەس نووسین .

لەوێنەی یەکەما « توَ » تەواو کەری ناوی « نووسین » ە .

لەدووەما « کاغەز » تەواو کەری سەربەخوَی § ٧٨ فعلی «نوسین» ە.

لەسێیەما سفەتی « خێرا » تەواو کەری ناوی « نوسین » ە .

لەچوارەما زەرفی « خێرا » تەواو کەری فعلی « روَیین » ە .

لە پێنجەما ( بە دەس ) تەواو کەری بەیارەی فعلی ( نووسین ) ە .

## تەواو کیردنی دوولانی .

**٨٨** . دوولانی سیفەتێکی فعلە کە خاسەی سفەتیشی هەیە . ئەم سفەیەش کەسێدار نیە؛ یەعنی ناتوانێ لە پێشەوە یەکێ لە بۆناوە کەسیەکان کە ئە یینە باسانکراو وەر گرێ § ٦٦ . لەبەر ئەمە بەوێنەی سفەت ئەبێتە تەواو کەری ناو ، بۆ ناوبان سفەتێکتیر § ٨٣ وەکو ،

منالی نوستوو .

تۆی نوستوو .

داری زۆر سووتاو .

**٨٩** . ئەگەر دوولانی بەسفەتێ تەواو بکرێ هەر دووکیان پێکەوە سفەتێکی لێکدراو دوروست ئەکەن § ٩٢ ؛ وەکو ،

داری کۆنە سووتاو .

لێرەدا سفەتی « کۆن » دوولانی « سووتاو » ی تەواو کیردووە ، بەلام پێکەوە چوونەتە شێکلی سفەتی لێکدراوەوە .

## کەلیمەی رووت و کەلیمەی لێکدراو .

**٩٠** . پارچەکانی قسە بە پێی دوروست بوونیانەوە دوو چەشنین :

١ . کەلیمەی رووت

٢ . کەلیمەی لێکدراو .

**٩١** . کەلیمەی رووت ئەو پارچانەن کە هەر لە کەلیمەیێ دوروست بوون ؛ وەکو ،

خانوو ، چاك ، ئێوە ، کیردن، بۆ ، کەی ؟ ، وە ، ئاخ ! .

# لێکدان ،
# کەلیمەی لێکدراو .

٩٢ . لێکدان یەك خیستنی دوو یا لە دوو پتیر کەلیمەیە بۆ دوروست کیردنی پارچەیێکی قسە . ئەو کەلیمانەی وا ئاوا ئەدرێن پێ یان ئەڵێن کەلیمەی لێکدراو ؛ وەکو ،

هەورە تریشقە .

ئەمە ناوێکی لێکدراوە کە لە ناوی « هەور » و ئەداتی تەواوی « ە » و ناوی « تریشقە » دوروست بووە .

٩٣ . ئەبێ کەلیمەی تەواو کراو لە کەلیمەی لێکدراو جوی بکرێتەوە . هەرچی وەکو کەلیمەی تەواو کراوە § ٧٢ بە پێی گەرەکیەوە تەواو کەری وەرگیر توە وەکەلیمەکەو تەواو کەرەکەی جوی جوی لە جوملە دا موعامەلە ئەبینین : وەکو ،

سەربانی خانوو .

سەربانەکانی خانووەکان .

لەوێنەی یەکەما « سەربانی خانوو » کەلیمەیێکی تەواو کراوەوە تاکە . کەوستمان گەلیان بکەینەوە ، وەکو لەوێنەی دووەما پیشاندراوە ، تەواوکراوەکە و تەواو کەرەکە جوی جوی گەل ئەکرێنەوە .

بەڵام هەرچی کەلیمەی لێکدراوە ئە توانرێ هەموو پارچەکانی بەسەر یەکەوە وەکو پارچەیێکی قسەی رووت موعامەلەی لەگەڵ بیکرێ ؛ وەکو ،

هەورە تریشقە .

هەورە تریشقەکان .

وەکو لەوێنەی دووەما ئەبینری ، ئەم ناوە لێکدراوە کە لە سێ کەلیمە دوورست بووە وەکو کەلیمەێکی ڕووت گەل کراوە تەوە .

٩٤ . پارچە کانی قسە هەر هەشتیان کەلیمەی لێکدراو شیان هەیە :

| پارچە کانی قسە . | کەلیمەی ڕووت . | کەلیمەی لێکدراو . |
|---|---|---|
| ناو . | هەور . | هەورە تریشقە . |
| سفەت . | شین . | چاوشین . |
| ئۆناو . | مین . | خۆم . |
| فعیل . | پەڕین . | هەڵ پەڕین . |
| ئەداتی تەواوی . | لە . | لە ژێر . |
| زەرف . | خێرا . | دەس و دەم |
| ئەداتی بەکخەر . | ئەگەر . | هەرچەنێ |
| ئەداتی نیدا . | هاوار . | هەی هاوار. |

باسی کەلیمە لێکدراوەکان لەپاشا لەگەڵ باسی هەر پارچە یێکی قسەدا جوی جوی ئەکەین .

## گرێ .

٩٥ . گرێ دەستەکەلیمەیێکە — تەواو کراوێ ولێکدراوبێ — کە باسکیان § ٦٥ تیانەبێ وە بەتەنیا وەکاری یەکێ لە پارچە کانی قسەبیبینین .
هەر دەستە کەلیمە یێك باسێکی تیا بێ جوملەیە § ٥٤ .

## سیفەکانی گرێ .

٩٦ . گرێ هەشت سینفی هەیە :

١ . گرێی ناوی ؛ وەکو ،

پیاوی چاك . (کەلیمەی تەواو کراو . )

گوێ سوانە . (کەلیمەی لێکلبراو . )

٢ . گرێی مەسدەری ، ( ئەمەش ئەتوانرێ پێی بیبێژرێ گرێی ناوی ) ؛ وەکو ،

لەسەربان نوستین . (کەلیمەی تەواو کراو . )

گوم کیردین . (کەلیمەی لێکلبراو . )

٣ . گرێی سفەتی ؛ وەکو ،

ی چاك . (کەلیمەی تەواو کراوە ؛ سفەتی چاك تەواو کەری ئەداتی تەواوی « ی » یە . )

بێ باك . (کەلیمەی لێکلبراو . ) x

٤ . گرێی دوولابی ، ( ئەمەش ئەتوانرێ پێی بیبێژری گرێی سفەتی ) ؛ وەکو ،

داری سووتاو . (کەلیمەی تەواو کراو . )

زیکەسووتاو . (کەلیمەی لێکلبراو . ) X

گیا خوڕ . (کەلیمەی لێکلبراو . ) X

٥ . گرێی تەواوی ؛ وەکو ،

لەسەر ئەرز . (کەلیمەی تەواو کراوو . )

لەسەر . ( کەلمەی لێکدراو . )

٦ . گرێی زەرفی ؛ وەکو ،

ئەو لەماڵەوە نوستووە ( « لەماڵەوە » کەلمەی تەواو کراوە . )

پاشەوپاش . ( کەلمەی لێکدراو . )

٧ . گرێی نەکخەری ؛ وەکو ،

هەرچەند . ( کەلمە ی لێکدراو . )

٨ . گرێی ندائی ؛ وەکو ،

باوکە رۆ !

٩٧ . هەموو گرێیێکی تەواو نی ، بێجگە لە گرێی لێکدراوی تەواوی ، یا گرێی سفەتیە یا گرێی زەرفیە . ئەگەر گرێکە ناوێك یان سفەتێکی تەواو کیردبێ گرێی سفەتیە ، ئەگەر فعلێکی تەواو کیردبێ گرێی زەرفیە .

## بەند .

٩٩ . بەند جوملەیێکە کە پارچە بێ بێ لە جوملەیێکی گەورە تیر ؛ وەکو ،

ئەو منالەی دوێنێ دیمت ئەمڕۆ نەخۆش کەوت .

ئەمە جوملەیێکە دوو باسی تیا یە ؛ یەعنی دوو جوملەی تیایە . هەر یەکێ لەم جوملانە پێی یان ئەلێن بەند .

١٠٠ . جوملەیێ چەند باسی تیابێ لەوەندە بەند درووست بووە .

## ناو .

١٠١ . ناو كەلیمەیێكە كە بۆ ناو لێ نانی كەسێ یان شتێك بەكارئەهێنرێ .

## سینفەكانی ناو .

١٠٢ ناو دوو سینفی هەیە :

١ ناوی تایبەتی .

٢ ناوی هەموو .

١٠٣ ناوی تایبەتی ناوی كەسێ یان شتێكی تایبەتییە ؛ وەكو ،

حەمە ، گۆیژە ، هەڵەبجە ، حاجی قادیر ، سەرشەقام .

بەهەموو پیاوێ نابێژرێ « حەمە » ، بە هەموو شاخێ نابێژری « گۆیژە » ، بە هەموو شارێ نابێژرێ « هەڵەبجە » ، بەهەمو كەسێ نابێژرێ « حاجی قادیر » وە بە هەموو گەرەكێ نابێژرێ « سەرشەقام » .

١٠٤ . ناوی هەموو ئەوەیە كە بە هەموو ئەو كەس و شتانە كە جینسیان یەكە ئەبێژرێ ؛ وەكو ،

پیاو ، خانوو ، بارەدار .

بە هەموو پیاوێك ئەبێژرێ « پیاو » ، بەهەموو شێرێك ئەبێژرێ « شێر » ، بەهەموو خانووێك ئەبێژرێ « خانوو » وە بە هەموو بارەدارێك ئەبێژرێ « بارە دار » .

# ناو ئەتوانرێ لەسەر هەندێ سینفی کەش جوی بکرێتەوە .

١٠٥ . ناوی مەعنەوی ناوی خاسسەتێك یان بیرێکی هەمووی بە یان ئاکا ؛ وەکو ،

تیرس ، تا ، لەرز ، زەردی ، ئازایی .

١٠٦ . ناوی مەسدەر ناوی کارێ یان حالێکە ؛ وەکو ،

هەڵوکێن ، فێلبازی ، کرنکاری ، رەشی ، زەردی ، هاتین ، نووسین ، بوون .

١٠٧ . ناوی کۆمەڵ بەناوێك ئەڵێن کە هەرچەندە شیکلەکەی تاك بێ بەڵام کۆمەڵێکی کەس یان شیت ئەهێنێتە بیر ؛ وەکو ،

لەشکیرەکە گەیشتە جێ .

رانەکە گەڕاوەوە ناو دێ .

لێرە دا « لەشکیر » گەلێ سوپایی ، « ران » گەلێ مەڕ و بزین وەبێنێتە بیر .

## جینسی ناو .

١٠٨ . مەعنای ناوی کساندار دوو جینسی هەیە :

جینسی نێر .

جینسی مێ . وەکو ،

ئەسکەندەر ، پیاو ، باووك ، ئەسپ ... لەجینسی نێرین .

خونچە ، پوور ، خوشاك ، مامێن ، ماکەو ... لە جینسی مێن .

١٠٩ . لەکوردیا ناو بە پێی جینسی مەعنایەوە بێجگە لە § ١١٤ و ٥ حالی یانگ کراوی تووشی هیچ موعامەلەیکی تایبەتی نابێ وە نێر و مێی مەعنای ناو تەئسیر لەسەر پارچەکانی تری قسە ناکا [ ٠ ] . بەلام لەگەلی زمانەکانی ترا جینس تەئسیر لەسەر ناو ، بۆناو ، سفەت ، فعیلوە زۆرف ئەکا .

## ئەداتی تەعریف

١١٠ . ئەداتی تەعریف ئەوەیە کە ئەخرێتە دوای ناوەوە بۆ جوی کردنەوەی مەعنای ناوێك لەناو هاوچەشنی خۆیا ؛ وەکو ، ئەگەر بلێین ـ

پیاو ریشی هەیە .

ناوی « پیاو » تەعریف نەکراو ئەبێ ، چونکە لە مەعناکەی هەموو پیاوی دینیادێتە بیر . بەلام ئەگەر بلێین ـ

پیاوەکە ریشی هەیە .

ناوی « پیاو » تەعریف کراو ئەبێ ، چونکە لە مەعناکەی هەموو پیاوی دینیا نایەتە بیر ؛ هەر ئەو پیاوە دێتە بیر کە لامان مەعلوومە . وەئەگەر بلێین ـ

پیاوێ ریشی هەبوو

---

[ ٠ ] لە کوردی سەروو دا ئەم فەرقە هەیە ؛ ئەگەر ناوی تەواو کراو نێر بێ ئەداتی تەواوی مەنای ئەم و تەواوکەرەکە « ێ » وە ئەگەر تەواو کراوەکە مێ بێ « ا » ئە بێ ؛ وەکو ، بابێمین ، برائ مین ، خوشکاتە ، دایکاوی .

دمسانەوە ناوی « پیاو » تەعریف کراو ئەبێ ، چونکەلە مەعنا کەی هەمو وپیاوی دینیا نابێتە بمر . بەلام ئەم تەعریفە بەجۆرێکی نا مەعەنە . وە وا ئە بمێرێ کەناو بەدوو چەشن تەعریف ئەکرێ وە لە بەر ئەوە دوو چەشن ئەداتی تەعریفەهە یە [ ٠ ] :

١ . ئەداتی تەعریفی مەعەن .

٢ . ئەداتی تەعریفی نامەعەن .

**١١١** . **ئەداتی تەعریفی مەعەن « ە کە » یە وە وەکو لە ژێرەوە** پیشاندراوە ئەخرێتە دوای ناوەوە .

**١١٢** . ئەگەر حەرفی دوای ناوەکە دەنگی بێ بان حەرەکەی « وو ، ی » بێ راستە و خۆ ئەداتی « ە کە » بەکەلك ئەهێنری ، وەکو ،

| | |
|---|---|
| بەرد | بەردەکە . |
| باخ . | باخەکە . |
| کاهوو . | کاهووەکە . |
| ماسی . | ماسیەکە . |

حا [ ٠ ] ئەداتی تەعریف ئەتوانرێ لەسفەت بپێژمێررێ ، بەلام مونامسەبەتی لەگەل ناو زیاترە : ئەداتی تەعریف لەگەل ناوا بە دەرەجە یێ ئە بێ بەیەك کە لە گەل کیردنا بەیەکەوە گەل ئەکرێنە وە ؛ وەکو ،

پیاوەکە . پیاوەکان .

کەچی سفەتی ئشارەت ئەکەوێتە دەوری ناوە گە لـکیراوەکەوە ؛ وەکو ،

ئەم پیاوە . ئەمپیاوانە .

١١٣ . ئەگەر حەرفی دوا ی ناوەکە خەرەکە بێ ،

( ١ ) حەرە کە ی « ە » بێ بە کێ لە « ە » کان هەڵ ئە گیرێ ؛ وەکو ،

کوندە .            کوندە کە .

هێزە .            هێزە کە .

( ٢ ) حەرەکەی « ا ، ێ ، ۆ » بێ ،

(أ) ناوە کە یەك هیجایێ ،

« ی » یێك ئەخرێتە پێش « ە کە » وە ؛ وەکو ،

گا .            گا یە کە .

دێ .            دێیە کە .

دۆ .            دۆ یەکە .

(ب) ناوەکە دوو هیجا ی بێ ؛

« ە » ی « ە کە » فرێ ئە درێ ؛ وەکو ،

کابرا .            کابرا کە .

هەرمێ .            هەرمێکە .

پەڕۆ .            پەڕۆ کە .

( ٣ ) حەرە کەی « وي ، ێو » بێ ،

« ی » یێك ئەخرێتە پێش « ە کە » وە ؛ وەکو ،

گوي .            گويیە کە .

دەزێو .            دەزێو یەکە .

١١٤ . هەندێ جار بەتەنیا حەرفێکی « ە » بۆ نێروە حەرفێکی

« ێ » بۆمێ وەکو حەرفێکی تەعریفی مەعیەن بەکەڵك ئەهێنرێ ؛ وەکو،

کورە تاسایەوە . ( کورەکە تاسایەوە . )

پوورێ هاتەوە . ( پوورەکە هاتەوە . )

ئەمانە زۆر کەم بەکەڵك ئەهێنرێن ، بەڵام لەدوای ئەو سفەتانەوە کە وەکو ناو بەکەڵك ئەهێنرێن زۆرتر ئەبینرێن ؛ وەکو ،

سەوزە . سەوزێ .

چیلگەز ڕەشە . چاو بەخومارێ .

## ئەداتی تەعریفی نامەعیەن .

١١٥ . ئەداتی تەعریفی نامەعیەن « ێ » یان « ێك » ە ، وە بەچەشنێ کەلە ژێرەوە پێشاندراوە ئەخرێتە دوای ناوەوە .

١١٦ . ئەگەر حەرفی دوای ناوەکە حەرکە بێ « ی » یێك ئەخرێتە مەیانی ناوەکەو ئەداتی تەعریفی نامەعیەنەوە ؛ وەکو ،

| | | |
|---|---|---|
| برا . | برایێ . | برایێك . |
| کوندە . | کوندەیێ . | کوندەیێك . |
| هەرمێ . | هەرمێیێ . | هەرمێیێك . |
| پەرۆ . | پەرۆیێ . | پەرۆیێك . |
| گەروو . | گەروویێ . | گەروویێك . |
| گوێ . | گوێیێ . | گوێیێك . |
| دەزیو . | دەزیویێ . | دەزیویێك . |

١١٧ . ئەگەر حەرفی دوای ناوەکە « ی » بێ « ی » یێکی کەی لێ زیاد ناکرێ وەکو ،

ماسی ،　　　ماسییێ ،　　　ماسیێك .

**١١٨** . ئەگەر حەرفی دوای ناوەکە دەنگی بێ هەر «ێ» یان «ێك» بەکەلك ئەهێنری ؛ وەکو ،

پیاو .　　　پیاوێ .　　　پیاوێك .

مریشك .　　　مریشکێ .　　　مریشکێك .

**١١٩** . ئەگەر لەدوای ناوەکە بەکێ لە بۆناوە پێوە نووساوەکانی «یم ، یت ، ی ، مان ، تان ، یان » گەرەك بێ هەر ئەداتی « ێك » بە کەلك ئەهێنری وە بە پێی حەرفی دوایی ناوەکە بەوێنەی دوو مادەکەی پێشەوە موعامەلەی لەگەل ئەکرێ ؛ وەکو ،

پیاوێکیم ، کوندەیێکی ، پەرۆیێکمان . مەرێکتان .

**١٢٠** . ئەگەر لەدوای ناوەکە ئەداتی تەواوی « ی » یان ئەداتی بەکخەری « و » بیبی وەکو § ١١٩ موعامەلەی لەگەل ئەکرێ ؛ وەکو ،

پیاوێکی چاك . بزنێك و مەرێ . هەرمێیێکی گەنیو .

## ژمارەی ناو .

**١٢١** . ژمارە خاسیەتێکی ناوە کە تاکی و گەلی پیشان ئەدا .

**١٢٢** . لەکوردیا ناو دوو ژمارەی هەیە ؛

١ . ژمارەی تاك .

٢ . ژمارەی گەل .

**١٢٣** . ژمارەی تاك هەر تەنیا کە مێ یان شتێك پیشان ئەدا ؛

وەکو ،　　　پیاوەکە .　　　پشیلەکە .

　　　پیاوێك .　　　پشیلەیێ .

١٢٤ . ژماره ی گه ل له به کێ پتێر کەس مان شێت پشان ئه دا.
وه کو ،

پیاوه کان .        پشمله کان .
ئەم پیاوانه .        ئەم پشملانه .

١٢٥ . ئەو ناوانەی ژماره مان تا که پێ مان ئه لێن ناوی تاك
وئەو ناوانه ی ژماره مان گەله پێ مان ئەلێن ناوی گه ل .

## گه ل کیردنەوە ی ناو .

١٢٦ . جاران له شێوەی سلێمانیشا وه کو ئێستا کەله گه ل شێوه کانێترا ئه بینرێ ناو راسته و خۆ ئه داتی گه لی ئەخرانه دواوه و گه ل ئەکرا یەوه . بەڵام ئێستا له شێوەی سلێمانیا بۆ گه ل کیردنەوەی ناوێ ئه بێ ئەداتی تەعریفی مەعنەنی له گەل بێ مان سفەتی ئیشارەتی « ئەم... ه » مان « ئه و ... » ؛ وه کو ئەگەر بلێن ـ

باخەوانه که دار ئه برێتەوه .

لەناوی«دار»دارێك وگەلێدار یش ئێته بیر ، چونکەله § ١١٠ دا ووتو بومان که ناوێکی بێ حەرفی تەعریف دەلالەت له جینسی خۆی ئه کا . لێرەدا « دار » خۆی و چەندی ی مەعلوم نیه . لەبەر ئەوه بۆگەلی پێویست نیه بلێن ـ

باخەوانه که   داران   ئەبرێتەوه .

١٢٧ . له کوردیا ئه داتی گەل «ا ن » ه وه وه کو له خوارەوه نوسراوه ئەخرێته دوای ناوەوه .

١٢٨ . ئەگەر ناوه که ئەداتی تەعریفی مەعنەنی له سەر بێ ئەداتی

گەل ئەخرێتە دوای ئەمەوە ؛ وەکو ،

کەوشەکە .          کەوشەکان .

**١٢٩** . ئەگەر ناوەکە سفەتی ئشارەتی لەگەڵا بێ لە پێشا گەل ئەکرێتەوە و ئینجا سفەتە ئشارەتیەکەی ئەخرێتە پاڵ ؛ وەکو ،

ئەم کەوشە .          ئەم کەوشانە .

ئەم کەندووە .          ئەم کەندووانە .

**١٣٠** . ئەگەر حەرفی دوای ناوەکە دەنگی بێ ڕاستەو خۆ «ان» [٠] بەکەڵك ئەهێنرێ ؛ وەکو ،

ئەم پیاو ە .          ئەم پیاوان ە .

ئەم بەرد ە .          ئەم بەردان ە .

**١٣١** . ئەگەر حەرفی دوای ناوەکە حەرەکە بێ ،

(١) حەرەکەی « وو ، ی » بێ ؛

دیسانەوە ڕاستەو خۆ « ان » بەکەڵك ئەهێنرێ ؛ وەکو ،

ئەم کەندوو ە .          ئەم کەندووان ە .

ئەم تانجی ە .          ئەم تانجیان ە .

(٢) حەرەکەی «ە» بێ ئەم حەرەکەیە فڕێ ئەدرێ ؛ وەکو ،

کەوشەکە .          کەوشەکان .

کوندە .          ئەم کوندانە .

---

[٠] لە شێوەی ناوە ڕاستی کوردیستانی ڕۆژ هەڵاتی و خوارو دا ئەداتی گەل « گەل » مان « ەل » ە ؛ وەکو ،

پیاو گەل .          منالەل .

(٣) ئەگەر حەرکە کانتیر بێن « ی » ێتك ئەخرێتە دوایانەوە ؛

وەکو ،

برا . ئەم برایانە .

هەرمێ . ئەم هەرمێیانە .

پەرۆ . ئەم پەرۆیانە .

ئەسکوی . ئەم ئەسکویانە .

١٣٢ . ناوێ سفەتی ژمارە و سفەتی موبهەم و سفەتی پیرسی لەسەر بێ گەل ناکرێتەوە ؛ وەکو ،

چوار پیاو . هەندێ منال . چەند کارەکەر ؟

## وەزیفەی ناو .

١٣٣ . وەزیفەی ناو ئەو کارەجوی جویانە یە کە ئە یان بینێ لە ناو جوملەدا . ناو شەش وەزیفەی هەیە :

١ . باسلێکراوی .

٢ . تەواوکەری سەربە خۆ .

٣ . تەواوکەری بەیارێ .

٤ . تەواوکەری باسی ناتەواو .

٥ . تەواوکەری ناو .

٦ . نیدا ی.

١٣٤ . بێجگە لە کاری نیدا نیدا ناو لە هیچتیریانا بەپێی وەزیفەیەوە تووشی هیچ گۆرانێ نابێ .

## وەزیفەی باسلێکراوی .

١٣٥ . باسلێکراو § ٥٢ ناوی ئەو کەسە یان ئەو شتەیە کە فعیل یان باس خەبەر لە کار و حالی ئەدا § ٥٤ ، § ٥٥ ؛ وەکو ،

١- پشیلە گۆشتەکەی خوارد .

٢- بەفیر ئەبارێ .

٣- شار بازێر خۆشە .

٤- مەجۆل باوکی میردووە .

لە جوملەی ١ ــ ٣ دا « پشیلە ، بەفیر ، شاربازێر » باسلێکراوین . لە جوملەی چوارەما « باوکی » باسلێکراوی فعلی « مـیردووە » یەوە ، « مەجۆل » باسلێکراو ی باسی « باوکی میردووە » یە .

بۆ تێ گەیشتینی وەزیفەی تەواوکەری سەربە خۆ ، تەواوکەری بە باریە ، تەواوکەری باسی ناتەواو ئەبێ لێرەدا سیغـەکانی فعیل بە یان بکەین .

## فعلی موتەعەددی و لازیم .

١٣٦ . فعیل دوو سیغی هەیە :

١ . فعلی موتەعـەددی کارێ بەیان ئەکا کە لە باسلێکراوەوە تەجاوەزی کە سێ یان شتێکتیر بکا ؛ وەکو ،

پیاو گۆشت ئەخوا .

لەم جوملەیەدا ناوی « پیاو » باسلێکراوە ، « ئەخوا » فعلەوە ئەم کارە لە « پیاو » ەوە تەجاوەزی « گۆشت » ی کیردووە . لەبەر ئەوە پێی

ئەڵێن فىعلی موتەعەددی .

٢ . فىعلی لازیم کارێ بان حالێ بە یان ئەکا کە لە باسلێکراوە وە راستە و خۆ تەجاوەزی کەسێ یان شتێکتیر نەکا ؛ وەکو ،

قەل ئەفرێ .

لەم جوملەیەدا باسلێکراو « قەل » ە وە ئەفرێ فىعلە وە ئەم کارە لە باسلێکراوا ئەمێنێتەوە وە لێوە راستە وخۆ تەجاوەزی کەسێ یان شتێکتیر ناکا . لەبەر ئەوە پێی ئەڵێن فىعلی لازیم .

## وەزیفەی تەواوکەری سەربەخۆ .

**١٣٧** تەواوکەری سەربەخۆ § ٧٨ ناوی ئەو کەسە یان ئەو شتەیە کە کاری فىعلی موتەعەددی راستە و خۆ تەجاوەزی ئەکا : وەکو ،

پیاو گۆشت ئەخوا .

لێرەدا « گۆشت » تەواوکەری سەربەخۆی فىعلی « ئەخوا » یە . چونکە ئەم فىعلە موتەعەددییە لە باسلێکراوی « پیاو » ەوە راستە و خۆ تەجاوەزی کیردووە .

**١٣٨** . فىعلی لازیم تەواوکەری سەربەخۆی نییەوە نابێ .

## وەزیفەی تەواوکەری بەیاریە .

**١٣٩** . تەواوکەری بەیارە § ٧٨ ناوی ئەو کەسە یان ئەو شتەیە کە کاری فىعلێك بەیارەی ئەداتێکی تەواو ئەوە تەجاوەزی کیردووە وە بەم چەشنە مەعنای فىعلەکەی تەواو کیردووە ، وەکو ،

مین کاغەزێکیم بە پۆستە دا نارد .

منالەکە لە هەیوان نوست .

لەم جوملانە دا ناوی « پۆستە » و « هەیوان » مەعنای فعلی موتە- عەددی « نارد » وفعلی لازمی « نوست » یان بە بارەی ئەداتی تەواوی « بە » و « لە » وە تەواو کیردووە ؛ لە بەر ئەمە تەواوکەری بە بارەیان پێ ئەلێن .

١٤٠ . هەموو تەواوکەرێکی بەبارە بە خۆی و ئەداتی تەواوسەکەیەوە وەکو گرێیێکی زەرفە § ٩٥ ، § ٩٦-٦ . لە دوو وێنەکەی سەرەوە دا گرێی تەواوی « بە پۆستە دا » و « لە هەیوان » گرێی زەرفیین .

# فعلی بوون.

١٤١ . فعلی بوون فعلێکی لازمە وە ئەتوانێ —

١ . بوونی کە سێیان شتێك بەیان بکا . لەم کارەیا مەعنا کەی وەکو فعلێکی لازم تەواوە ؛ وەکو ،

کاڵەك لە بێستان ئەبێ .

لێرە دا « کاڵەك » باسلێکراوە ، « لە بێستان ئەبێ » باسە ، « ئەبێ » فعلی لازمە ، « لە بێستان » تەواوکەری بە بارەتی .

٢ . بارەی ووتینی شتێك ئەدا لە حەق کە سێیان شتێکا . لەم کارەیا مەعنا کەی ناتەواوە ؛ پێی ئەلێن باسی ناتەواو § ٩٥، § ٦٧ ، § ٧٧ ؛ وەکو ،

پا وانەکە زێرە .

پیرۆز نەخۆش بو .

## وەزیفەی تەواوکەری باسی ناتەواو .

**١٤٢** . ناوی کەسێ یان شتێك کە مەعنای باسی ناتەواو بەبێ یارەی ئەداتێکی تەواوی تەواو بکا پێی ئەڵێن تەواوکەری باسی ناتەواو . ئەوانەی بە یارەی ئەداتی تەواو ببوە مەعنای باسی ناتەواو تەواو ئەکەن تەواوکەری بە یاریەن § ١٣٩ . وەکو ،

عەربەت شار بو .

شوان لەگەڵ ئێمە بە .

لەوێنەی یەکەما « شار » تەواوکەری باسی ناتەواوی «بو» وە لەدووەما « لە گەڵ ئێمە » تەواوکەری بە یارەی باسی ناتەواوی « ە » یە .

**١٤٣** . نابێ تەواوکەری باسی ناتەواو لەگەڵ تەواوکەری سەربەخۆ تێکەڵ بیکرێن ؛ وەکو ،

قەل گۆشت ئەخوا .

عەرەبەت شار بووە .

لە جوملەی یەکەما « قەل » باسلێکراوە ، « گۆشت ئەخوا » باسە ، « ئەخوا » فعلی موتەعەددیە ، « گۆشت » تەواوکەری سەربەخۆیەتی .

لە جوملەی دووەما « عەربەت » باسلێکراوە ، « شار بووە » باسە ، « بووە » باسی ناتەواو ، « شار » تەواوکەریەتی . « گۆشت » فعلی « ئەخوا » تەجاوەزی کیردووە ، « شار » فعلی « بووە » تەجاوەزی نەکیردووە و هەر دوو کیشیان بە بێ یار بە مەعنای فعلەکانیان تەواو کیردووە .

# وەزیفەی تەواوکەری ناو .

## ناوی تەواوکەری ناو .

١٤٣ . ناوی‌تەواوکەری ناو ناوی کەسێ یان شتێکە کە بۆتەواوکردنی مەعنای ناوێکیتر ئەهێنرێتە لا بەوە § ٧٢ - § ٧٥ . ناوێك ئە توانرێ بەناوێك ، بەدوو ، بەسێ ناو .. . هتد . تەواو بیکرێ ؛ وەکو ،

دار دەستی زەمو .

ئارەزووی خوێندین .

کێلکی ئەسپی ئاغا .

١٤٤ . ناوی تەواوکەر بە یارمەی ئەداتی تەواوی « ی » بەوە [ ٭ ] ئەنووسی بە ناوە تەواوکراوەکەوە § ٧٦ ؛ وەکو ،

دەفتەری ماموستا .

بای باران .

سێوی سەردەشت .

مووی سەر .

١٤٥ . ئەگەر دوا حەرفی ناوی تەواوکراو « ی » « یێ » « ی » بێ ئینکی کە ی لێ زیاد ناکرێ ؛ وەکو ،

تانجی ئەحمەد پاشا .

---

[ ٭ ] ئەو ناوانەی مقدار پیشان ئەدەن و سفەتی ژمارەی یان لەسەرە لە تەواوکرانیانا ئەداتی تەواوی « ی » یان نابێ ؛ وەکو ، سێ بار ترێ . کۆڵێ نان . دوو چارۆکە گینگیر . چوار هۆقە شەکر .

# ئەداتی تەعریف لەگەڵ ناوی بەناو تەواوکراوا .

١٤٦ . لە تەواوکراو و تەواوکەر هەرکامێکمان بوستری تەعریف بیکرێ ئەداتی تەعریف ئەخرێتە پاش ئەوەیان ، ئەگەر بوستری هەر دووکیان تەعریف بیکرێن ئەداتی تەعریف ئەخرێتە پاش هەر دووکیان؛ وەکو ،

کلیلی دەرگا . هیچیان تەعریف نەکراوین .

کلیلەکەی دەرگا .
کلیلێکی دەرگا . } « کلیل » تەعریف کراوە .

کلیلی دەرگاکە .
کلیلی دەرگایێك . } « دەرگا » تەعریف کراوە .

کلیلەکەی دەرگاکە .
کلیلێکی دەرگایێك. } هەر دووکیان تەعریف کراوین .

١٤٧ . هەندێ جار تەعریف کردنی ناوی تەواوکەر بۆ تەواوکراوەکەش بەسە ؛ وەکو ، لە باتی بڵێین —

کلیلەکەی دەرگاکە .

کلیلێکی دەرگا یێك .

ئەتوانین بڵێین —

کلیلی دەرگاکە .

کلیلی دەرگایێك ..

# گەل کیردنەوەی ناوی بەناو تەواوکراو.

١٤٨ . ئێمە ئەزانین کە بۆ گەل کیردنەوەی ناوێك ئەبێ لە پێشا بە ئەداتی تەعرێفی مەعەن تەعریف بیکرێ § ١٢٦. بە پێی ئەم قاعدەیە لە تەواوکراو و تەواوکەر گەل کیردنەوەی کامیان گەرەك بێ ئەداتی تەعریفی مەعەنی ئەخرێتە سەر و گەل ئەکرێتەوە § ١٢٧ ؛ وەکو ،

کلیلەکانی دەرگا . / ناوی تەواوکراو گەل کراوەتەوە .
کلیلەکانی دەرگایێ . |

کلیلی دەرگاکان . / ناوی تەواوکەر گەل کراوەتەوە .
کلیلێکی دەرگاکان . |

کلیلەکانی دەرگاکان . هەر دووکیان گەل کراونەوە .

١٤٩ . هەندێ جار گەل کیردنەوەی ناوی تەواوکەر بۆ تەواوکراوە ـ کەش بەسە ؛ وەکو ، لە باتی بلێین —

کلیلەکانی دەرگاکان .

ئەتوانین بلێین ـ

کلیلی دەرگاکان .

## بەدەل .

١٥٠ . بەدەل ناوێکە کەخرابێتە دوای ناوێکی کەوە بۆ ئیزاح کیردنی مەعنای . بەدەل هەرچەندە ناوێکە وناوێکی کەی تەواو کیردووە § ١٤٣ ، لە مەنانی تەواوکەر و تەواوکراوەکەدا § ١٤٤ هیچ ئەداتێ نابێ. ناوی بەدەـ لدار وە زیفەی چی بێ بەدەلەکەشی ئەو وەزیفە بە ئەبینێ ؛ وەکو ،

کوێخای دێ مام ڕەسووڵ هات .

تۆ مامۆستام مەلاحەمەدی دیوە ؟

پوورم لەگەڵ ئاغاژین گێلاس خان بو .

لەم جوملانەدا « مام ڕەسووڵ » بەدەلی « کوێخادێ» یە ، «مەلاحەمەد» بەدەلی « مامۆستام » ە ، « گێلاس خان » بەدەلی « ئاغاژین » ە .

١٥١ . لەکوردیدا ئەو ناوەی بەدەلی بیبێ ئەبێ یان ناوێکی تەواو کراوبێ یان ناوێکی لێکدراوبێ .

## وەزیفەی نیدائی .

١٥٢ . ناوی کەسێ یان شتێ کە هەر بۆ بانگ کیردین و ڕوو تێ ـ کیردین بەکەڵك بهێنرێ ولە گەڵ هیچ فەعلێکا لاقە نێکی نەبێ پێی ئەڵێن نیدا کراو ؛ وەکو ،

کوڕە ، تۆ بۆچی ناچیتە مەکتەب ؟

ئەمجارە نۆرەی تۆ یە ، پیشکۆ .

لەم جوملانەدا « کوڕە » ، « پیشکۆ » نیدا کراوین .

## دروست کیردنی ناوی نیداکراو .

١٥٣ . ا . لەناوی تاکا :

. . حەرفێکی « ە » [ ٠ ] ئەخرێتە دوای ئەو ناوانەوە کەدوا حەرفیان دەنگمە ، ئەو ناوانەی دوا حەرفیان حەرەکە یە

[ ٠ ] بۆ جینسی مێ لە باتی « ە » زۆر جار « ێ » بەکەڵك هێنراوە § ١٠٩ ؛ وەکو ،

پوورێ ، خوشکێ ، پاڵلێم شۆڕێ .

هیچ ناخرێتە دوا یانەوە ؛ وەکو ،

کوڕە ، جوتیارە ، ئاغا ، میرزا .

ب . هەندێ جار ئەداتی تەعریفی « ەکە » ئەخرێتە دوای ناوەوە ؛ ئەمەبۆ نەزاکەتو دۆستی و پاڕانەوە بەکەڵك ئەهێنرێ ؛ وەکو ،

مارفەکە ، کوڕەکە ، براکە .

ج . هەندێ جار ئەداتی « ئەی » ئەخرێتە پێش ناوەوە ؛ وەکو ،

ئەی حوکومدار ، چی بێ و لەتۆ نەهێنی بێ ؟

د . ئەتوانرێ ناو بە بێ ئەدات و حەرفی زیادیش نیدا بیکرێ ؛ وەکو ،

شوان ، ئەم ڕێیە بۆکوێ ئەچێ ؟

خەسرەو ، تۆ بۆچ لەگەڵیم ناڕێکی ؟

خورشید ، دایکیم بانگیت ئەکا .

نەریمان ، لەکوێ بوی ؟

٢ . لەناوی گەلا ـ

ئەبێ لە پێشا ناوەکە بەبێ ئەداتی تەعریف گەل بیکرێتەوە ، لە پاشا « ی ئەداتی گەل بگۆڕرێ بە « ی » و حەرفێکی « ە » لەدوای «ن» گەلەوە دابینرێ ؛ وەکو ،

| ناوی تاك . | ناوی گەل . | ناوی ندا کراو . |
| --- | --- | --- |
| شاگیرد . | شاگیردان . | شاگیردینە . |
| پیاو . | پیاوان . | پیاوینە . |
| ئاغا . | ئاغایان . | ئاغاینە . |

لەگەل ئەمەشا ئەتوانرێ ئەداتێکی « ئەی » یان بخرێتە پێش؛ وەکو ، ئەی شاگیردینە ، دەمی تێ کوشینە .

## دوروست کیردنی ناو .

## ناوی دوروست کراو .

١٥٤ . ئەتوانرێ لەسفەت ، لە فعیل و لە ناو هەندێ چەشین ناو دوروست بیکرێ ؛ ئەم چەشنە ناوانە پێ یان ئەلێن ناوی دوروست کراو .

## ناوی دوروست کراو لە سفەت .

١٥٥ . بۆ دوروست کیردنی ناو ئەداتی « ی » ، «ێتی» ، « ایی » « انە » ، « ە » ، « ا » « ێتی » ، ئەخرێتە دوای سفەتەوە ؛ ئەو ناوانەی لە سفەت دوروست ئەکرێن هەموو ناوی مەعنەوین ؛ وەکو ،

| سفەت . | ناوی دوروست کراو . | | | | |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| پان . | پانی . | پانێتی . | پانایی . | | |
| چاك . | چاکی . | چاکێتی. | | چاکانە | چاکە . |
| سەوز ، | سەوزی . | سەوزێتی . | سەوزایی . | | |
| زەرد . | زەردی | زەردێتی . | زەردایی . | | |
| تیرشۆك . | | | | | تیرشۆکە . |

| سفەت. | ناوی دوروست کراو. | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| خۆش. | خۆشای. | خۆشێتی. | خۆشای | | | | خۆشێنی |
| رووسوور. | رووسووری. | رووسوورێتی | | | | | |
| گەرم. | گەرمی. | گەرمێتی | گەرمای | | | گەرما | |
| تەنگ. | تەنگی. | تەنگێتی. | تەنگایی. | تەنگانه | | | |
| تیرش. | تیرشی. | تیرشێتی. | تیرشایی. | | | | |
| قمرسن. | | | | | قمرسێنه | | |

**١٥٦** . لەم جەدوەلەی سەرەوەدا ئە بینرێ کە هەموو سفەتێ بە بارەی ئەداتی « ی » ، « ێتی » ەوە ئە کرێ بەناو . بەڵام ئەگەر دوا حەرفی سفه تەکە « ی » بێ « ێتی » بە کەڵك ئە هێنرێ ؛ وەکو ،

کەرکووکی . کەرکووکێتی .

وه ئەگەر دوا حەرفی سفەتەکە یەکێ لە حەرەکە کانی « ا ، ه ، ۆ ، وو ، ێ ، وي ، یو » بێ « ی » ئەخرێتە پێش « ێتی » ەوە ؛ وەکو ،

| | |
|---|---|
| ئازا . | ئازایێتی . |
| هەڵه . | هەڵەیێتی . |
| خەڕۆ . | خەڕۆیێتی . |
| ماندوو . | ماندوویێتی . |
| زۆر بڵێ . | زۆربڵێیێتی . |
| جوي. | جوییێتی . |
| کەوتیو . | کەوتیویێتی . |

ئەداتەکانی کە بۆ هەندێ سفەت ئەبێ و بۆ هەندێکیان نابێ . بۆ دانانی « ا ی » بەپێی حەرفی دوایی سفەتەکەوە وەکو § ١٢٨ — § ١٣١ موعامەلە ئەکرێ .

## ناوی دوروستکراو لە فعیل.

**١٥٧** . هەمووە مەسدەرێك ناوە [٠] وە هەرچی ناوێك لە فعیل پەیا بووبێ ناوێ مەعنەویە ؛ وەکو ،

خوێندین چاکە . ( « خوێندین » ناوە ، باسانکراوە . )

مین خوێندینم ئەوێ . ( « خوێندین » ناوە ، تەواوکەری سەر بەخۆیە . )

پیاو بە خوێندین گەورە ئەبێ . ( « خوێندین » تەواوکەری ئەداتی تەواوی « بە » یە . )

**١٥٨** . لە هەندێ فعیل ناوی تایبەتی دوروست بووە ؛ ئەمانە کە مین وە بۆ کە ماشیان ئەتوانرێ قاعیدە بینوێنرێ .

**١٥٩** . لەو فعلە لازمانەدا کە دوای مەسدەرەکانیان « اندین » ە ئەم « اندین » ە یان فری ئەدرێ وە « ە » ێك ئەخرێتە جێ یان ؛ وەکو ،

| فعیل . | ناوی دوروستکراو . |
|---|---|
| باراندین . | بارە . |
| زرنگاندین . | زرنگە. |

[٠] ناوی مەسدەری لە ناوی دوروستکراو ناژمێررێ.

١٦٠ . لەو فعلە لازمانە دا کە دوای مەسدەرە کانیان « ین » ە ئەم « ین » ەیان لێ فرێ ئە درێ وە « ە » ێك ئە خرێتە جێ یان ؛ وەکو ،

| فعیل . | ناوی دو روست کراو . |
|---|---|
| ئە قەین . | ئە قە . |
| کوّ کەین . | کوّ کە . |

١٦١ . ئەمانە هەندێ لەوانەن کە بێ قاعیدە دو روست بوون :

| فعیل . | ناوی دو روست کراو . |
|---|---|
| خە وتین . | خە و . |
| ژماردین . | ژمارە . |
| گە زین . | گاز . |
| زانین . | زانیست . |
| لە وەڕین . | لە وەڕ . |
| هەلکە وتین . | هەلکەوت . |
| کیردین . | کار . |
| جوّ شین . | جوّش . |
| ئێشان . | ئێش . |
| فە رموون . | فەرمان . |
| رەنجان . | رەنج . |
| دروون . | دروومان . |

# ناوی دوروست کراو لەناو .

**١٦٢** . بۆدوروست کیردنی ناو لە هەندێ ناو ئەداتی« ی »، «ێتی»، «ێنە» ، «یستان ، ستان » ، «ێن» ، «ێنی» ئە خرێنە دوا یانەوە؛ وەکو ،

| ناو . | ناوی دوروست کراو . | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| جێژن . | جێژنی . | جێژنێتی . | | | |
| ئاو . | ئاوی . | ئاوێتی . | | | |
| قەڕ . | قەڕی . | قەڕێتی . | | | |
| تەسك . | تەسکی . | تەسکێتی . | | | |
| دار . | داری . | دارێتی . | داریستان | | |
| هەلوك . | هەلووکی . | هەلووکێتی | | هەلووکێن | |
| کوڕ . | کوڕی . | کوڕێتی . | | | کوڕێنی |
| کیج . | کچی . | کچێتی . | | | کچێنی |
| ژن . | ژنی . | ژنێتی . | | | |
| پیاو . | پیاوی . | پیاوەتی . | | | |
| مەڕ . | مەڕی . | مەڕێتی . | | | |

لەمانە ئەوانەی بە « ێتی » و « ێنی » دوروست بوون ناوی مەعنەوی تەواوین ، ئەوانەی بە «ی » دوروست بوون بە پێی بەکارهێنانیانەوە ناوی مەعنەوین یان سفەتین .

« پیاوەتی » ڕاستەکەی « پیاوێتی » یە .

**١٦٣** . هەموو ناوێ بە یارمەی « ی » ، « ێتی » بەوە ئەکرێ بە ناوی مەعنەوی . بەلام ئەگەر ناوەکە دوا حەرفی «ی » بێ « ێتی » بەکارئەهێنرێ ؛ وەکو ،

تا نجی .          تانجێتی .

وه ئه گه ر ناوه‌که دوا حه‌رفی یه‌کێ له حه‌ره‌که‌کانی « ا ، ە ، ۆ ، وو ، ی ، وي ، یو » بێ «ی» یێ ئه‌خرێته پێش «تی»یه‌وه ؛ وکو ،

برا .          برا یێتی .

کونده .          کونده یێتی .

په‌رۆ .          په‌رۆ یێتی .

که‌ندوو .          که‌ندوو یێتی .

به‌هێ .          به‌هێیێتی .

خوي .          خوییێتی .

ده‌زیو .          ده‌زیو یێتی .

ئه‌داته‌کانی که بۆ هه‌ندێ ناو ئه بێ و بۆ هه‌ندێکیان نابێ .

ئه‌گه‌ر حه‌رفی دوای ناوه‌که حه‌ره‌که بێ له باتی « یستان » « ستان » یه‌کێک ئه‌هێنرێ .

## ناوی لێکدراو (بارگران) (١)

١٦٤ . ناوی لێکدراو به‌و ناوانه ئه‌ڵێن که‌له دوو یان له دوو پتیر که‌لیمه دروست بوو بێ § ٩٢ . له کوردیا ناوی لێکدراو زۆره .

## دوروست بوونی ناوی لێکدراو .

١٦٥ . له‌ناوێکی به‌ناو ته‌واو کراو —

١ . ئه‌داتی ته‌واوی «ی» یان له ناو هه‌ڵ گیراوه ؛ وه‌کو ،

| ناوی تەواو کراو . | ناوی لێکبڕاو . |
| --- | --- |
| داری گویز . | دار گویز . |
| جێی نویژ . | جێ نویژ . |
| داری گێلاس . | دار گێلاس . |

٢ . لەکەمیانا تەواو کەرەکە خراوەتە پێش تەواو کراوەکەوە وەئەداتی تەواوی « ی » دیسانەوە فرێ دراوە ؛ وەکو ،

ژنی برا .      برا ژین .

ئەنگاوی چێشت .      چێشت ئەنگاو . [ چێشتە نگاو . ]

٣ . لەهەندێکا ئەداتی تەواوی « ی » گۆڕراوە بە « ە » ی تەواوی وەکو ،

| | |
| --- | --- |
| بێچوو ی گا . | بێچووە گا . |
| کیلکی بێاڵ . | کیلکە بێاڵ . |
| کۆمەڵی بەفیر . | کۆمەڵە بەفیر . |

١٦٦ . لەناوێکی بەسفەت تەواو کراو ـ

١ . ئەداتی تەواوی «ی» ئەگۆڕڕی بە « ە » ی تەواوی ؛ وەکو ،

| | |
| --- | --- |
| بەردی ڕەش . | بەردە ڕەش . |
| ئەمەنی سوور . | ئەمەنە سوور . |
| خانی سووتاو . | خانە سووتاو. |
| مرشکی بەکیر . | مرشکە بەکیر . |

٢ . ئەوانەی حەرفی دواسان « ا » ، ە ، ێ ، ۆ ، وي ، بە ناتوانین

ئەداتی تەواوی « ە » وەر بیگرین ؛ وەکو ،

| | |
|---|---|
| گای بۆر . | گا بۆر . |
| کونبەی شیر . | کونبەە شیر . |
| پەرۆ ی کۆن | پەرۆ کۆن . |
| دێی سووتاو . | دێ سووتاو [٠] . |
| ئەسکوی شکاو . | ئەسکوي شکاو [٠] . |

٣ . لەمەبانی ناوی تایبەتی و عنوانەکەی دوا بادا هیچ ئەداتێ نابێ؛ وەکو ،

سلێمان پاشا .

بابەکر اغا .

٤ . جار جار سفەت پێش ناو ئەکەوێ و ئەداتی تەواوی «ە» ئەخرێتە دوایەوە ؛ وەکو ،

| | |
|---|---|
| بای رەش . | رەشە با . |
| پەلی سوور . | سوورەپەل . |
| گیای سەوز . | سەوزە گیا . |

٥ . هەندی جار ش لەمەبانی سفەت وناوەکەدا هیچ ئەداتێ نابێ ؛ وەکو ،

| | |
|---|---|
| وەستا گوورون . | رەش مار . |
| دەروێش کەریم . | چوار باخ . |

[٠] ئەمانە سفەتی لێکبراوشین § ٢٠٠ بەپێی بە کەلک هێنانیانەوە فەرق ئەکرێن .

١٦٧ . لە دوو ناوی سەر بەخۆ —

١ . ئەداتی بەکەری «و» یان لەمەیانا ئەبێ ؛ وەکو ،

لەرز و تا . بەفرو دۆ . کەژ و کێو .

٢ . ئەگەر ناوی دووەم «ئاو» بێ هیچ ئەداتێکیان لەمەیانا نابێ ؛ وەکو ،

شەکراو . گولاو .

١٦٨ . هەر مەسدەرێکی لێکدراو ناوێکی لێکدراوە § ٨٦ ؛ وەکو ،

ریق گیرتین . باز دان . هەڵگیرتین . دەس پێ کیردین .

## تەعریف کیردنی ناوی لێکدراو .

١٦٩ . ناوی لێکدراو وەکو ناوێکی رووت § ٩٣ تەعریف ئەکرێ ، یەعنی ئەداتی تەعریف راستە و خۆ ئەخرێتە دواوە ؛ وەکو ،

دار دەست . دار دەستەکە . دار دەستێك .

پەرۆ کۆن . پەرۆ کۆنەکە . پەرۆ کۆنێك .

رەش مار . رەش مارەکە . رەش مارێك .

## کەل کیردنەوەی ناوی لێکدراو .

١٧٠ . ناوی لێکدراو وەکو ناوێکی رووت کەل ئەکرێتەوە ؛ وەکو ،

دار گوێز . دار گوێزەکان . ئەو دار گوێزانە .

پەردە رەش . پەردە رەشەکان . ئەم پەردە رەشانە .

کەژو کێو . کەژو کێوەکان . ئەم کەژو کێوانە .

# ناوی بچووك كراو .

**١٧١** . ناو بە خیستنی ئەداتی « ۆلە » ، « وولە » ئەدوا یەوە مەعنای بچووكی ئەبێ تێ . ئەگەر دوا حەرفی ناوەكە حەرەكە بێ «ۆ» ی ئەداتەكە هەل ئەگیرێ . ئەو ناوانەی ئەداتی بچووكیان وەرگیرتووە پێ یان ئەلێن ناوی بچووكـ كراو ؛ وەكو ،

| ناو . | ناوی بچووكـ كراو . |
|---|---|
| بەرخ . | بەرخۆلە . |
| برا . | برالە . |
| پشیلە . | پشیلە . |
| دان . | دانوولە . |
| خانوو . | خانوولە . |
| مەشكە . | مەشكالە . ( مەشكەلە ) . |
| مێش . | مێشوولە . |

**١٧٢** . هەندێ ناو بە ئەداتی « ۆكـ ، ۆكە » ، « ەكـ ەكە » بچووك ئەكرێتەوە ؛ وەكو ،

| | |
|---|---|
| تیر . | تیرۆكـ . |
| مەنجەل . | مەنجەلۆكە . |
| پوول . | پوولەكـ ، پوولەكە . |

**١٧٣** . بۆ هەندێ ناوش « ۆلە » یان « وولە » و « كە » پێكەوە بەكەلك ئەهێنرێن ؛ وەكو ،

چۆ . چۆله . چۆلەکە .

جوو . جووله . جووله کە .

ئەمانە ش لەو تەرتیبە ئەچین :

چاو . چاوىلە . چاوىلکە .

جاش . جاشووله . جاشوولکە .

دەنزە . دەنزۆلە . دەنزۆلکە .

١٧٤ . لەناوی تایبە تیشا هەن کە بچووك کرابنەوە :ــ

سەعە . سەعۆل .

مەجە . مەجۆل .

قالە . قالۆل .

١٧٥ . ئەگەر بە ووردی تێ بفکیرێ ئەبینرێ کە ئەداتی بچووکی حەرفی « ل » و « ك » ین . حەرفە حەرەکەکانی پێشەوە یان بۆ پێوە نووسانیان بەناوەوە وەرگیرتووە . « ە » ی دوایشیان هێز ئەدا بە مەعنای بچوکی . لە « چاوىلە » دا لە باتی « ۆلە » یان « وولە » « ىلە » هێنراوە ، وەلە « دەنزۆلە » دا « ە » ی دوای دەنزە هەلگیراوە . لە « چاوىلکە » ، « جاشوولکە » ، « دەنزۆلکە » دا « ە » ی دوای « ل » ە کە فرێ دراوە . لەبەر ئەوە بۆ فێر بوونی راستی بچکۆلەی هەموو ناوێ ، ئەبێ بەلاو گوێ بیگرێ .

زرەو

## سفەت .

١٧٦ . سفەت کەلمەیێکە کە بۆ تەواو کیردنی مەعنای ناو یان بۆ ناو بەکەلك ئە هێنرێ .

## سینفەکانی سفەت .

١٧٧ . سفەت پێنج سینفی هەیە :

١ . سفەتی چۆنی .

٢ . سفەتی نشانی .

٣ . سفەتی ژمارەی .

٤ . سفەتی موبهەم .

٥ . سفەتی پرسی .

١٧٨ . سفەتی چۆنی ئەوانەن کە چۆنی ناو پیشـان ئە دەن ؛ وەکو ،

پیاوی بەد .

ترێی ڕەش .

لەمانەدا « بەد » ، « ڕەش » چۆنی « پیاو » ، « ترێ » پیشان ئەدەن ؛ سفەتی چۆنین .

١٧٩ . هەر چوار سینفەکەی کە پێی یان ئەڵێن سفـەتی تەعەینی ، چونکە ئەمانە چۆنی ناو پیشان نادەن ؛ هەر تەعەین یان ئەکەن ؛ وەکو ،

ئەم باخە .

چوار هەنار .

هەندێ منال .

چەند مەکتەب ؟

لەوێنە ی بە کەما سفەتی نشانی « ئەم ... ە » ناوی « باخی » تەعەین کیردووە ؛ بنجگە لە « ئەم باخە » باخێکی تیر ناشێتە بیر . لە دووەما سفەتی ژمارە ی « چوار » ناوی « هەنار » ی تەعەین کیردووە ؛ لە « چوار هەنار » کە ئتیر نان پتیر « هەنار » بە بیرانابی . لە سێ یەما سفەتی موبهەمی « هەندێ » ناوی « منال » ی بە پشاندانێکی موبهەم تەعەین کیردووە . لە چوارەما سفەتی پیرسی « چەند ؟ » بە روێکی پیرس ناوی « مەکتەب » ی تەعەین کیردووە .

# سفەتی چۆنی .

## وەزسفەکانی سفەتی چۆنی .

**١٨٠** . سفەتی چۆنی دوو وەزسفەی هەیە :

١ . ئە بێتە تەواوکەری ناو ؛ وەکو ،

گە نیمی پاك .

٢ . ئە بێتە تەواوکەری باسی ناتەواو § ٧٩ وە بەبارەی ئەم فعلەوە مەعنای ناوش تەواو ئەکا § ٧٧ ؛ وەکو ،

خەپێ ئازابە .

## وەزسفەی ناو تەواو کیردنی سفەتی چۆنی .

**١٨١** . سفەتی چۆنی بۆ تەواو کیردنی ناو ئەخرێتە دوابەوە وە ئەداتێکی تەواوی « ی » ش ئەنرێتە مەبانیانەوە ؛ وەکو ،

منالی زەرەك .

مووی زەرد .

١٨٢ . ئەگەر دوا حەرفی ناوی تەواو کراو « ێ » بێ « ی » ێکی کەی لێ زیاد نا کرێ ؛ وەکو ،

تانجی رەش .

# ئەداتی تەعریف لەگەل ناوی بە سفەت تەواو کراوا .

١٨٣ . ئەداتی تەعریفی موبهەمی « ێك » راستەو خۆ ئەخرێتە دوای ناوەکەوە § ١٢٠ ؛ وەکو ،

منالێکی زەرەك .

مووێکی زەرد .

تانجیەێکی رەش .

١٨٤ . بۆ ئەوەکە ناوێکی بە سفەت تەواو کراو بە ئەداتی تەعریفی مەعەیەن تەعریف بیکرێ ئەبێ لە پێشا بیخرێتە شیکلی ناوی لێکدرا وەوە §-١٦٦ ، ئەمجا ئەداتەکەی تەعریفمان لە سەر دا بینرێ § ١٦٩ ؛ وەکو ،

| ناوی بە سفەت تەواو کراو . | تەعریف کراوی . |
|---|---|
| منالی زەرەك . | منالە زەرەکەکە . |
| مووی زەرد . | مووە زەردەکە . |
| تانجی رەش . | تانجیە رەشەکە . |

# گەل کیردنەوەی ناوی بەسفەت تەواو کراو .

١٨٥ . بۆ گەل کیردنەوەی ناوی بە سفەت تەواو کراو ئە بێ لە پێشا بیخرێنە شیکلی ناوی لێکدراوەوە § ١٦٦ ، لە پاشا بە ئەداتی تەعریفی مەعمەن تەعریف بیکرێن یان سفەتی نشانەمان بیخرێتە سەر وە لە دوای ئەوە گەل بیکرێنەوە ؛ وەکو ،

| ناوی بە سفەت تەواو کراو . | تەعریف ونشان کراوی . | گەل کراوی . |
|---|---|---|
| منالی زیرەك . | منالە زیرەکەکە .<br>ئەم منالە زیرەکە . | منالە زیرەکەکان .<br>ئەم منالە زیرەکانە . |
| مووی زەرد . | مووە زەردەکە .<br>ئەم مووە زەردە . | مووە زەردەکان .<br>ئەم مووە زەردانە . |
| تانجی رەش . | تانجیە رەشەکە .<br>ئەو تانجیە رەشە . | تانجیە رەشەکان .<br>ئەو تانجیە رەشانە . |

# دوروست کیردنی سفەتی چۆنی . سفەتی چۆنی دوروست کراو .

١٨٦ . بێجگە لەو سفەتانەی وەکو ، جوان ، چاك ، درێژ ، سوور ... هتد . کەلە ئەسلا هەن ئەتوانرێ لەناو و لە فعیل هەندێ سفەتی چۆنی پەیا بیکرێ ، ئەو سفەتانەی چۆنیە کەوا ئێمە مەیان پێ یان ئەڵێن سفەتی دوروست کراو .

# سفەتی چۆنی لە ناو دوروست کراو .

١٨٧ . بۆ دوروست کردنی سفەتی چۆنی لەهەندێ ناو ئەو ئەداتانەی لەجەدوەوە لەکەی خوارەوەدا نووسراوین ، وەکو پێشاندراوە ، ئەخرێنە دوا یانەوە :

| سفەتی چۆنی دوروست کراو . | ئەدات . | ناو . |
|---|---|---|
| زیستانی . | ی . | زیستان . |
| کەرکووکی . | » | کەرکووك . |
| قاوەیی . | » | قاوە . |
| کەراچیی ی . | » | کەراچی . |
| پیاوانە . | انە . | پیاو . |
| کەرکووکیانە . | » | کەرکووکی [•] |
| کچانی . | انی . | کیژ . |
| کورانی . | » | کور . |
| شەرمین . | ین . | شەرم . |
| گۆشتین . | » | گۆشت . |
| ئاسنمەن . | مەن . | ئاسن . |
| قسەرمەن . | » | قسەر . |
| گورگ ئاسایی. (گورگاسای) | ئاسایی . | گورگ . |
| دارا ئاسایی . | » | دارا . |

[•] « کەرکووکی » سفەتەوە وەکو ناو بەکەلك هێنراوە .

| ناو . | ئەدات . | سفەتی چۆنی دوروست کراو . |
|---|---|---|
| کورد . | واری . | کوردواری . |
| تیرك . | « | تیرکواری . |
| کەر . | ەکی . | کەرەکی . |
| قور . | اوی . | قوراوی . |
| چەقۆ . (جاجیم .) | گەر . (کەر) | چەقۆگەر . (جاجیم کەر .) |
| باخ . | ەوان . | باخەوان . |
| تیرس . | نۆك . | تیرسنۆك . |
| لەرز . | ۆك . | لەرزۆك . |
| تا . | دار . | تادار . |

**١٨٨** . هەر چی ناوێ مەعنەوی نەبێ ئەتوانرێ بەبارەی « ی » و « دار » ، « کەر » ەوە بیکرێ بە سفەت . لەگەل ئەمەشا هەندێ لەم ناوانە بە پێی گەرەکی بەکەلك هێنانمان یان دوروست بوونمانەوە وەکو لە جەدوەلەکەدا ئە بینرێ بەبارەی هەندێ ئەداتی کەوە کراوین بە سفەت. بۆ ئەمانە قاعدە یکی تایبەتی نیە .

ناوی مەعنەوی بەبارەی « ی » ەوە ناکرێ بە سفەت . بەلام بەپێی دوروست بوون یان گەرەکمانەوە ، بە ئەداتەکانی کە ئەکرێن بە سفەت .

**١٨٩** . بۆ دانانی ئەم ئەداتانە بە پێی حەرفی دوایی ناوەکەوە وەکو §-١٥٦ ولە باسی حەرفی حەرەکەدا نوسراوە موعامەلە ئەکرێ .

# سفەتی چۆنی لە فیعیل دوروست کراو .

**١٩٠** . بەخیستینی ئەداتی « ۆك » ئەدوای رەگی (١) هەندێ فعلی لازمەوە سفەتی چۆنی دوروست بووە ؛ وەکو ،

گەڕان . گەڕۆك (٢).

بەزین . بەزۆك .

فڕین . فڕۆك .

لە « گیڕان » و « تیرسان » « گرینۆك » و « تیرسنۆك » هاتووە .

**١٩١** . سیغەی دوولانی ( ١ ) ڕابوردووی فعلی لازم و مەجهوول ڕاستەو خۆ سفەتین ؛ وەکو ،

میردوو . کوژراو .

# سفەتی چۆنی لێکدراو .

**١٩٢** . سفەتی چۆنی لێکدراو ئەو سفەتانەن کە لە دوومان لە دوو پتیر کەلمە دوروست بوون § ٩٢ . لە کوردینا وەکو ناوی لێکدراو سفەتی لێکدراوش زۆرە .

---

(١) بۆ تێگەیشتینی «رەگ» و سیغەی دوولانی تەماشای گەردانی فعیل بکە .

(٢) رەگی « گەڕان » « گەڕێ » یە . لێرەدا « ێ »یەکەی فڕێ دراوە .

# دوروست بوونی سفەتی چوونی لێکدراو .

١٩٣ . هەندێ جار لە ناوێکی بەناو تەواو کراو «ی» ی تەواو نی هەڵ ئەگرێ ؛ وەکو ،

| سفەتی لێکدراو . | ناوی بەناو تەواو کراو . |
| --- | --- |
| چاو باز . | چاوی باز . |
| گەردین قاز . | گەردنی قاز . |

١٩٤ . لە دوو ناوی سەربەخۆ –

١ . هیچ ئەداتێکیان لە مەیانا نابێ ؛ وەکو ،

لاق کوولەکە .

زیگ دەمز والکە .

٢ . یەکێ لە ئەداتی تەواوی « لە » ، « بە » ، « بێ » یان لەمەیانا ئەبێ ؛ وەکو ،

سیرکەی لەکوڵ

جامانە بەسەر .

ریش بێ شانە .

٣ . ناوێك دوو بارە ئەکرێتەوە ؛ وەکو ،

پارچە پارچە .

چەمن چەمن .

رێ رێ .

**١٩٥** . لە ناوێکی بە سفەت تەواو کراو —

١ . ئەگەر سفەتەکە چۆنی بێ ئەداتی تەواو ی « ی » مان لە ناو هەڵ ئەگیرێ ؛ وەکو ،

| ناوی بە سفەت تەواو کراو . | سفەتی لێکبڕاو . |
|---|---|
| مووی زەرد . | موو زەرد . |
| پارەی زۆر . | پارە زۆر . |
| چاوی بپرسی . | چاو بپرسی . |

٢ . سفەتی ناوەکە ژمارە ی ئەبێ ؛ وەکو ،

چوار چاو .

سێ سەر .

**١٩٦** . هەندێ جار ئەداتی تەواو ی « ە » ئەخرێتە مە نای دوو سفەتەوە ؛ وەکو ،

کۆنە دەوڵە مەند .

**١٩٧** . هەندێ بە خیستینی زەرفی « نا » ئەپێش سفەتەوە دوروست ئەبێ ؛ وەکو ،

نازێك . ناپاك .

**١٩٨** . هەندێك لە سفەتێك و کەلمە تێکتێر دوروست بووە وە لە مە نانانە ئەداتی بە کخەری « و » داناوە ، بە لام کەلمەی دووەم زۆر جار کەلمە تێکی بێ مەعنا ئەبێ ؛ وەکو ،

شیل و شوڕ . ووشك و برینگ . نەرم ونۆڵ . گورج و گۆڵ .

زەردو زۆڵ . تارسك و نووتەك . پان و پۆر . ساردو سیر .

ئەبامنرێ کە کەلمەی دووەمی هەندێکیان لەحەرفی بەکەمی سفەتەکەو « وَل » یان « وَر » دوروست بووە

١٩٩ . لەبەکێ لە ئەداتی تەواوی « بە » ، « بێ » یان لە ئەداتی « هاو » و ناوێك دوروست ئەبین ؛ وەکو ،

بەدەس . بێکەس . هاو دەنگ .

٢٠٠ . لە ناوێك و سفەی دوولایی فعلی موتەعەددی یان سفەی دوولایی رابوردووی لازیم ومەجهوول دوروست ئەبین ؛ وەکو ،

نان خۆر . باووك مردوو .

بابیردوو . سەر پێچراو .

## سفەتی چۆنی بچووك کراو .

٢٠١ . هەندێ سفەت بەخیستینی ئەداتی « وَلە » ، « ەلە » ، « ملە » ئەدوا بەوە مەعنای بچووکی ئەدرێتێ . ئەم چەشنە سفەتانە پێ یان ئەلێن سفەتی بچووککیراو ؛ وەکو ،

| سفەت . | سفەتی بچووککیراو . |
|---|---|
| نەرم | نەرمۆلە . نەرمەلە . نەرمىلە . |
| ناسیك . | ناسکۆلە . ناسکەلە . ناسکىلە . |
| سپی . | سپیلە . |
| سەوز . | سەوزەلە . |

٢٠٢ . بۆ هەندێ « ۆك » بە كەلك ئە هێنرێ ؛ وەكو ،

بار . باروك .

تیرش . تیرشۆك .

٢٠٣ . هەندێ جارش « كەلە » بەكەلك ئە هێنرێ ؛ وەكو ،

سوور . سووركەلە .

سپی . سپیكەلە

سەوز . سەوزكەلە .

ئەو ئیمزاحەی لە § ١٧٥ دا دا ومانە بۆ سفەتیش ئە شێ .

## سفەتی چۆنی وەكو ناو بەكەلك ئەهێنرێ .

٢٠٤ . ئە توانرێ هەموودە مێ سفەتێكی چۆنی لە باتی ناو بە كەلك بهێنرێ ، ئەو سفەتەی وەكو ناو بە كەلك هێنرابێ ئەتوانێ وەزیفەی ناو بە تەواوی بێ بەمێنێ بەلام ئە بێ بزانرێ كە لە پێش ئەو سفەتە وە هەمیشە ناوێكی شاراوە هەیە ؛ وەكو ،

شتێكیم دی . ( پیاوێكی شێتیم دی . )

شێتەكەم دی . ( پیاوە شێتەكەم دی . )

## پایەكانی مەعنای سفەتی چۆنی .

٢٠٥ . مەعنای سفەت سێ پایەی هەیە :

١ . پایەی عادی .

# سفەتی نشانی .

٢٠٩ . سفەتی نشانی ئەو سفەتانەن کە بۆ ئشارەت کردنی کەسی یان شتێك ئەخرێنە پاڵ ناوەکەوە . سفەتی نشانی ئەمانەن :

| بۆ دوور . | بۆ نزیك . |
|---|---|
| ئەو ... ە . | ئەم ... ە . |

٢١٠ . سفەتی نشانی ناوە نشانیدراوەکە – تاك بێ و گەل بێ ، رووت بێ و لێکدراوبێ – ئەگرێتە ناو خۆیەوە ؛ وەکو ،

ئەم پیاوە . ئەو پیاوە .

ئەم پیاوانە . ئەو پیاوانە .

ئەم کیلکە بێلانە . ئەو کیلکە بێلانە .

٢١١ . ئەگەر ناوەکە بە ناو نکمتیر تەواو کرابێ لەمانە هەر کامێکیان نشانیدانی گەرەك بێ ئەو ئەخرێتە ناو سفەتەکەوە ؛ وەکو ،

ئەم دارەی میزگەوت . داری ئەم میزگەوتە .

ئەو دارانەی میزگەوت . داری ئەو میزگەوتانە .

هەندێ کەس جوملەکانی لای راست واش ئەبێژن :

ئەم داری میزگەوتە ،

ئەم دارانەی میزگەوتە .

لە جوملەی دووەما « ە » ی دوای « دارانە » زیادە . بەڵام هێنانی ئەمە پێو ستە § ١٦٢ .

٢١٢ . ئەگەر ناوەکە بە سفەت تەواو کرابێ لە پێشا ناوەکە لەگەڵ

تەواو کەرەکەیا ئەخرێتە شیکڵی ناوی لێکبڕاودوە § ١٦٦ ، لە پاشا ئەخرێتە ناو سفەتی نیشانیەوە ؛ وەکو ،

گوڵی سوور .    ئەم گوڵە سوورە .

**٢١٣** . ئەگەر دوا حەرفی ناوی نیشانبراو یەکێ لە حەرەکەکانی « ە ، ا ، ێ ، ۆ ، وي ، یو » بێ « ی » بێ ئەخرێتە پێش « ە » ی نیشانیەوە ؛ وەکو ،

ئەم کەرەیە .   ئەو گایە .   ئەم دێیە .   ئەو دۆیە .

ئەم گوییە .   ئەو دەزوویە .

**٢١٤** . سفەتی نیشانی بەتەنیا بەکەڵک بهێنرێ ئەبێتە بۆناوی نیشانی § ٢٨٧ .

## سفەتی ژمارەیی .

**٢١٥** . سفەتی ژمارەیی ئەو سفەتانەن کە بۆ ژماردنی کەسێ یان شتێك ئەخرێنە پاڵ ناوەکەیەوە .

## چەشنەکانی سفەتی ژمارەیی .

**٢١٦** . سفەتی ژمارەیی دوو چەشنی هەیە :

١ . سفەتی ژمارەیی ئەسلی .

٢ . سفەتی ژمارەیی ڕوتبەیی .

## سفەتی ژمارەیی ئەسلی .

**٢١٧** . سفەتی ژمارەیی ئەسلی ئەوانەن کە وەکو یەك ، دوو ، سێ ، چوار . هتد . چەندیی کەس یان شیێ پیشان ئەدەن . ئەمانە ، ناوەکە

رووت بێ ، لێکبراوبێ ، ئەخرێتە پێشەوە . بەلام ناوەکە هەمیشە تاك ئەمێنێتەوە § ١٣٢ ؛ وەکو ،

چوار شاگیرد . دەمنال . هەشت سەرەبزووت .

**٢١٨** . ئەگەر ناوەکە بەناوتەوا کراوبێ ژمارەی دەرکامێکیان گەرەك بێ سفەتی ژمارەی ئەسلی ئەخرێتە پێش ئەوە یانەوە ؛ وەکو ،

شەش ماموستای مەکتەب .

ماموستای شەش مەکتەب .

## سفەتی ژمارەی ڕوتەبی .

**٢١٩** . سفەتی ژمارەی ڕوتەبی بۆپیشاندانی تەرتیبی ڕیزی کەسێ یان شتێك بەکەڵك ئەهێنرێ . بۆ دوروست کیردنیان ئەداتی « ەم » یان « ەمین » ئەخرێتە دوای ژمارەی ئەسلیەوە . ئەگەر دوا حەرفی ژمارەی ئەسلی یەکێ لە حەرەکەکانی « وَ ، ێ » بێ « ی » یێك ئەخرێتە پێش ئەداتەکەوە ؛ وەکو ،

| ژمارەی ئەسلی . | ژمارەی ڕوتەبی . |
|---|---|
| یەك . | یەکەم . یەکەمین . |
| دوو . | دووەم . دووەمین . |
| سێ . | سێیەم . سێ یەمین . |
| نۆ . | نۆیەم . نۆ یەمین . |
| سی . | سیەم . سیەمین . |

**٢٢٠** . ئەگەر ژمارەکە لە مەبانی « دە » و « بیست » ا بێ یان « پەنجا ، حەفتا ، هەشتا » بێ « ە » ی پێش « ەم » و « ەمین » هەل

ئه گیرێ . بۆ « پەنجا ، حەفتا ، هەشتا » « مم » نابێ ؛ وەکو ،

پانزەم . پانزە مەمین .

پانزەم . پانزەممین .

پەنجامەمین . حەفتامەمین . هەشتامەمین .

**٢٢١** . لە پاش ژمارەی « دە » « ی » ێك زیادئە کرێ ؛ وەکو ،

دە . دەیەم . دەیەمەمین .

هەندێ کەس « دەمەمین » یش ئەلێن .

**٢٢٢** . سفەتی ژمارەی ڕوتە بێ بە قاعیدە ئەبێ بخرێتە پاش ناوەوە ، بەلام پێش خیستینیشی ئەشێ . ناوێك لەگەڵ ئەم سفەتەدا هەمیشە تاك ئەمێنێتەوە ؛ وەکو ،

منالی دووەم . دووەم منال .

شەوی سێیەمەمین . سێیەمەمین شەو .

# ژمارەی کەسری .

**٢٢٣** . ئەو ژمارانەی وورد پیشان ئەدەن هەندێ ماموستای دەستوور پێیان ئەلێن ژمارەی کەسری . ئەمانە ژمارەی لێکدراوین وە لە دوو ژمارەی ئەسلی دوروست ئەبین : ئەگەر ژمارەی دووەم ژمارەی « یەك » نەبێ ئەدانیتە واوی « لە » ئەخرێتە پێش ژمارەکەی یەکەمەوە ، وئەگەر ژمارەی دووەم « یەك » بێ ئەم ئەدانیتە وارە پێویست نیمە ؛ وەکو ،

لە پێنج دوو . لە بیست چوار .

چوار یەك . هەزار یەك .

**٢٢٤** . ژماره‌ی که سرلی پێش ناو ئه خرێ وه به ئاربه ی ئه داتی ئه واوی « ی » ئه وه به ناوه که وه ئه نووسێ ؛ وه کو ،

چوار ئه کی ئه‌م کتێبه .

له هه شت پێنجی ئه‌م منالانه .

**٢٢٥** . « ئه‌مو » ژماره ئێکی ئه سلیه ، « ئه‌موه » ژماره ئێکی که سرئیه ؛ وه کو ،

ئه‌مو قران .

ئه‌موه ی ئه‌م منالانه .

## سفه‌تی ژماره‌ی وه‌کو ناو به‌کارلك ئه‌هێنرێ .

**٢٢٦** . ئه توانرێ سفه تێکی ژماره ی وه کو ناو به که‌لك بهێنرێ . به لام ئه بێ بزانرێ که له گه لیا ناوێکی شاراوه هه یه ؛ وه کو ،

چوار یان هاتین .　　( چوار پیاو یان هاتین . )

پێنج ئه کیان روین .　　( پێنج ئه کی پیاوه کان روین . )

شه‌شه‌م هات .　　( شه‌شه‌م پیاو هات . )

## سفه‌تی موبهه‌م .

**٢٢٧** . سفه تی موبهه‌م ئه وانه‌ن که ئه خرێنه پال ناوه وه بۆ پێشاندانی که سێ یان شتێك به جوورێکی موبهه‌م . ئه مانه سفه تی موبهه مین :

| | |
|---|---|
| هەندێ . | هەر کام ... ێ . |
| گەلێ . | هەرچی ... ێ . |
| فلان . | هەرچۆن ... ێ. |
| کام . | چۆن ... ێ . |
| هیچ ... ێ . | تیر . |
| هەموو ... ێ | کە . |
| هەر .. ێ | وا . |
| چەند ... ێ | وەها . |
| چی . . ێ | زۆر . |
| | کەم . |

٢٢٨ . لەم سفەتە موبهەمانە « هەندێ ، گەلێ ، فلان ، کام . » پێش ناو ئەکەوین ؛ وەکو ،

هەندێ منال . گەلێ ژین . فلان پیاو . کام کوێخا .

ـ ٢٢٩ . ئەو سفەتە موبهەمانەی « ێ » شێکی جویان لە دواوەیە ناوەکە ئەگیرنە ناو خۆیانەوە ؛ وەکو ،

هیچ منالێ . چی پیاوێ . چۆن کارەکەرێ .

هەموو گیانێ . هەرکام کتێبێ .

هەر دارێ . هەرچی گەلابێ .

چەند مامۆستایێ . هەرچۆن کارێ .

٢٣٠ . سفەتی « تیر ، کە، وا ، وەها . » ئەکەونە پاش ناوەوە وە لە پێشیانەوە ئەداتی تەواوی « ی » وەر ئەگرن ؛ وەکو ،

پیاوی تیر . نانی کە . کچی وا . کوری وەها .

٢٣١ . سفەتی « زۆر ، کەم » هەم ئەکەونە پێش ناوەوە ، هەم ئەکەونە دوا یەوە . ئەگەر دوای بکەوێن ئەداتی تەواوی « ی » ئەخرێتە مەیانیانەوە ؛ وەکو ،

زۆر منال . منالی زۆر .

کەم پارە . پارەی کەم .

٢٣٢ . ئەو ناوەی بە « تیر » ، « کە » وە « هەموو » تەواو کرابێ ئەتوانێ ئەداتی تەعریفی مەعلوم ونامەعلوم وەربگرێ . لەبەر ئەمە گەل کیردنەوە شی ئەبێ ؛ وەکو ،

دارێکەتیر . دارەکەی تیر . دارەکانەتیر .

دارێکەکە . دارەکەیکە . دارەکانەکە .

هەموو دارێک . هەموو گەنەکە . هەموو دارەکان .

٢٣٣ . ناوی پێش « وا ، وەها ، زۆر ، کەم . » هەر ئەتوانێ ئەداتی تەعریفی نامەعلوم وەربگرێ ؛ وەکو ،

دارێکی وا . سێوێکی وەها .

پارەیێکی زۆر . پارەیێکی کەم .

٢٣٤ . سفەتی « هەندێ ، گەلێ ، چی ، چۆن ، وا ، وەها ، زۆر ، کەم ، هەرچۆنێ ، هەرچەیێ ، هەرچەندێ . » ئەبنە تەواوکەری باسی ناتەواو ؛ وەکو ،

ئەم خەلوزە هەندێکە .

ئەم مێوژە گەلێکە .

فیکری ئەو چی ( چی ) بێ منیش ئەوەم ئەوێ .

فیکری ئەو چۆن بێ منیش وا ئەڵێم .
منالە کە وایە .
با وکی وە هایە .
ئەم گە نیمە زۆرە .
ئەم برینجە کەمە .
شووتیە کە هەرچۆنێ بێ بلەهێنە .
فیکری ئێوە هەرچێ بێ چاکە .
پارە کە هەرچە ندێ بێ وەرگرە .

**٢٣٥** . « چی ، چي ، چۆن » ی رووت کەبیبین بە تەواو کەری باسی ناتەواو « ێ » ی جویان نابێ .

## سفەتی موبهەمی لێکدراو .

**٢٣٦** . سفەتی « هەندێ ، گەلێ » وە ئەوانەی « ێ »ی جویان لەدواوەیە بە سفەتی موبهەمی لێکدراو ئەژمێررێن . هەموو « ێ » یەکان ئەداتی تەعریفی نامەعمەنین .

## سفەتی پیرسی .

**٢٣٧** . سفەتی پیرسی ئەوانەن کە بۆ پیر سینی کە سێ یان شتێك ئەخرێنە پاڵ ناوەکەوە . سفەتی پیرسی ئەمانەن :

| | |
|---|---|
| کام ؟ | چی ؟ |
| چەند ؟ | چۆن ... ێ ؟ |
| چۆن ؟ | چي ... ێ ؟ |

٢٣٨ . سفەتی « کام ؟ » ، « چەند ؟ » پێش ناو ئەکەوێن ؛ وەکو ،

کام دێ ؟

چەند دێ ؟

٢٣٩ . سفەتی « چۆن ؟ » ، «چی ؟» دوای ناو ئەکەوێن وەلەمە مانانا ئەداتی تەواوی « ی » ئەبێ ؛ وەکو ،

خانووی چۆن ؟

خانووێکی چۆن ؟

گەزی چی و مقەستی چی ؟

٢٤٠ . سفەتی « چۆن ... ێ » و « چی ... ێ » ناوەکە ئەگیرنە ناو خۆیانەوە ؛ وەکو ،

چۆن خانووێ ؟

چي منالێ ؟

٢٤١ . سفەتی « کام ؟ چەند ؟ چۆن ؟ چی ؟ » ئەبنە تەواو کەری ...سی ناتەواو ؛ وەکو ،

ئەسپەکە کامە ؟

پارەکە چەندە ؟

باوکیت چۆنە ؟

ئەو رەشاییە چیە ؟

٢٤٢ . سفەتی « چۆن ... ێ » ، « چي ... ێ ؟ » بە سفەتی ...رسی لێکدراو ئەژمێررێن ، « ێ » یەکەی دوایان ئەداتی تەعریفی ...عەیەنە .

## بۆناو .

٢٤٣ . بۆناو کەلیمەیێکە کە لەباتی ناوێ کە لە پێشا ووترابێ یان لە بیرابێ بەکەلك ئەهێنرێ . دووبارە کیردنەوەی ناوێك ، ئەزانین کەشتێکی جوان نیە ؛ ئەمجا بە یارمەی بەکەلك هێنانی بۆناوەوە لەم ناشیرینیە ریزگار ئەبین ؛ وەکو ،

لەباتی بلێین —

مین کاغەزەکە ئەخوێنمەوە وە کاغەزەکەتێ ئەگەم وەکاغەزەکە ئەدڕێنیم .

ئەلێین —

مین کاغەزەکە ئەخوێنمەوە وەتێ ئەگەم وە ئەی دڕێنیم .

لەمانەدا « ی » ی کەلیمەی « تێی ئەگەم . » و « ئەی دڕێنیم . » بۆناوین ، چونکە لەباتی ناوی « گاغەزەگە » بەکەلك هێنراوین .

٢٤٤ . ئەو ناوانەی بۆناو جێیان ئەگرین پێیان ئەلێین شار .

٢٤٥ . هەر بۆناوێ ئەبێ لە کەس و ژمارە دا ٢٧٤ § هاوڕێی شارەکەی بێ .

## سینفەکانی بۆناو .

٢٤٦ . بۆناو حەوت سینفی هەیە :

١ . بۆناوی کەسی .

٢ . بۆناوی نیشانی .

٣ . بۆناوی لێکبەر .

٤ . بۆناوی موبهەم .

٥ . بۆناوی پیرسی .

٦ . بۆناوی خۆیی .

٧ . بۆناوی میلکی .

## بۆناوی کەسی .

**٢٤٧** . بۆناوی کەسی بۆ جوێ کیردنەوەی سێ کەسەکە بەکار ئەهێنرێ .

**٢٤٨** . سێ کەسەکە تاك وگەلیان هەیە وە ئەمانەن :

کەسی یەکەم : ئەوەیە کە قسەی ئەکا ؛ وەکو ،

مین ئەڕۆم ، ئێمە ئەڕۆن .

کەسی دووەم : ئەوەیە کە قسەی بۆ ئەکرێ ؛ وەکو ،

تۆ ئەڕۆی ، ئێوە ئەڕۆن .

کەسی سێیەم : ئەوەیە کە قسەی لێ ئەکرێ ؛ وەکو ،

ئەو ئەڕوا ، ئەوان ئەڕۆن .

## سینفەکانی بۆناوی کەسی .

**٢٤٩** . بۆناوی کەسی دوو سینفی هەیە :

١ . بۆ ناوی کەسی سەربەخۆ .

٢ . بۆ ناوی کەسی پێوە نووساو .

## بوناوی کەسی سەربەخۆ .

**٢٥٠** . بۆ ناوی کەسی سەربەخۆ ئەمانەن :

| | تاك . | گەل . |
|---|---|---|
| کەسی یەکەم . | مین . | ئێمە . |
| کەسی دووەم . | تۆ . | ئێوە . |
| کەسی سێیەم . | ئەو ، ~~ئەوە ، ئەوێ~~ . | ئەوان . |

**٢٥١** . بۆ ناوی « ئەو » بۆ کەس ، بۆ ناوی « ئەوە » بۆ شیت، بۆ ناوی « ئەوێ » بۆ جێ بەکەلك ئەهێنرێ ؛ وەکو ،

نەخەیر ، ئەو ئەمرۆ نایێت .

حەنێ ، ئەوە ئەسپێکی چاك بو .

ئەلێن ئەوێ زۆر خۆشە .

لەم جوملانەدا « ئەو ، ئەوە ، ئەوێ » بۆ ناوی کەسی سەربەخۆن .

## وەزیفەی بۆناوی کەسی سەربەخۆ .

**٢٥٢** . بۆناوی کەسی سەربەخۆ پێنج وەزیفەی § ١٣٥ هەیە :

١ . باسلێکراوی § ١٣٧ ؛ وەکو ،

ئەو نان ئەخوا .

٢ . تەواوکەری سەربەخۆ § ١٣٧ ؛ وەکو ،

ئێمە ئێوە ئەناسین .

٣ . تەواوکەری بەیاربە § ١٣٩ ؛ وەکو ،

مین ئەمە لەتۆ ئەسێنم .

٤ . تەواوکەری باسی ناتەواو § ١٤٢ ؛ وەکو ،

کوێخا کە مینم .

٥ . تەواو کەری ناو § ١٤٣ ؛ وەکو ،

رانکە کەی ئەو .

لەوێنەی یەکەما « ئەو » باسلێکراوە ، لەدووەما « ئێوە » تەواو کەری سەربەخۆ یە ، لەسێ یەما « لەتۆ » تەواو کە ری بەبار یە یە ، لە چوارە ما « مین » تەواو کەری باسی ناتەواو ، لە پێنجەما « ئەو » تەواو کەری ناوی « رانکە کە » یە .

## بۆناوی کەسی پێوە نووساو [٠]

**٢٥٣** . بۆناوی کەسی پێوە نووساو ئەمانەن :

| کەسی . | تاك . | | گەل . | |
|---|---|---|---|---|
| | لەدوای حەرەکەوە . | لەدوای دەنگمەوە . | لەدوای حەرەکەوە . | لەدوای دەنگمەوە . |
| یەکەم . | م . | یم . | ن ، مان . | ین ، مان . |
| دووەم . | ی ، ت . | ی ، ی ، ە | ن ، تان . | ین ، تان . |
| سێ یەم . | ا ، ی . | ێ ، ی . | ن ، ان . | ین ، ان . |

« م » و « ت » و « ن » هەندێ جار لەدوای دەنگمشەوە دێن ؛ لەبەردەمانەوە ئەمان بیننەن .

[٠] باسی بۆناوی پێوە نووساو لەگەڵ باسی گەردانی فعلە کانا بخوێنەرەوە. ئێستا بە پێی فعل و دەمو کەس وژمارە وحەرفی کەلمەی پێشەوە یانەوە هەر شکیلمان پیشانابراوە . لە باسی گەر دانا، کەی ئەکەونە پێش یان پاش فعلەوە ، پاش ئەداتی تەواوی و بۆناوەوە پیشان ئەدرێ .

# وەزیفەی بۆناوی کەسی پێوەنووساو .

٢٥٤ . بۆناوی کەسی پێوە نووساو چوار وەزیفەیەی هەیە § ١٧٣ :

١ . باسلێکراوی .

٢ . تەواوکەری سەربەخۆ .

٣ . تەواوکەری بەیاربە .

٤ . تەواوکەری ناو .

## وەزیفەی باسلێکراوی § ١٣٥ .

٢٢٥ . لە کوردیدا بۆناوی کەسی پێوە نووساو لە باتی بۆناوی کەسی سەربەخۆ وەزیفەی باسلێکراوی ئەبینێ بەکەڵك هێنانی بۆناوی کەسی سەربەخۆ لەگەڵ ئەمانەدا بۆ تەئکیده ؛ وەکو ،

مین بەرد ئەشکێنیم .

ئێوه ماستاوتان خواردەوه .

ئێمه ئەڕۆین .

لەم سێ جوملەیەدا ئەگەر باسلێکراوی «مین» ، « ئێوه » ، « ئێمه » هەڵ بگیرێن هیچ زەرەرێ بەمەعنا کانیان ناگا . چونکه « یم » ی دوای « ئەشکێنیم » و « تان » ی دوای « ماستاو » و « ین » دوای « ئەڕۆین » کاری باسلێکراوی جوملەکان ئەبینین .

٢٥٦ . بەڵام بۆ لێك جوێ کردنەوەی کەسی دووەم و سێ یەمی گەل لەهەندێ دەما کە لە باسی فعلا نیشان ئەدرێن ، ئەبێ بۆناوی کەسی

سەربەخۆش بە کەڵك بهێنرێ ، چونکە بۆ ناوە پێوە نووساوەکانمان لە مەك ئەچین ؛ وەکو ،

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| کەسی دووەم . | ئەنوون . | نووستوون . | ئەخۆن . | بخۆن . |
| کەسی سێ یەم . | ئەنوون . | نووستوون . | ئەخۆن . | بخۆن . |

ئێستا ئەگەر بلێن « ئەنوون » مەعلووم نابێ ، « ئێوە ئەنوون . » یان « ئەوان ئەنوون . » لە بەر ئەمە لەم چەشنە دەمانەدا ئەگەر بۆ تێ گەیشتن گومانێ ببێ بۆ ناوە کەسمە سەربەخۆکان بەکەڵك ئەهێنرێ .

**٢٥٧** . ئەگەر لە دوای بۆ ناوی کەسی « ا » ، « ێ » ئە داتی تەواوی « ە » ببێ حەرفێکی « ت » ئەخرێتە پاشمانەوە وەئەو دەمە ئەبنە « ات » ، « ێت » ؛ وەکو ،

ئێوارێ مامیم ئەگاتە جێ .

دۆکتۆر دەرمانەکە ئەکاتە پیاڵەکەوە .

پشیلەکە ئەکەوێتە بیرەکەوە .

چێشتکەرەکە پیاز ئەجنێتە مەنجەڵەکەوە .

**٢٥٨** . ئەگەر بوسترێ بۆ تەئکید ئەداتێکی «ین» یش ئەخرێتە دوای ئەم « ات » و « ێت » ەی سەرەوە ؛ وەکو ،

ئەڕوا . — ئەڕواتین . ئەگرێ . — ئەگرێتین .

**٢٥٩** . ئەگەر لە دوای بۆ ناوی کەسی دووەمی « ی » ، « ێ » ئەداتی تەواوی « ە » یان حەرفی « ا » ببێ ئەتوانرێ حەرفێکی « ت » بخرێتە دوای ئەم بۆ ناوانەوە ؛ وەکو ،

تۆ ئەمڕۆ ئەگەیتە سووورداش . ( ئەگەیە سووورداش . )

تۆ مناڵێ کەکەی ئەبەیتە پەرەمەگروون؟ (ئەبەیە پەرەمەگروون؟)
تۆ ئەچیتە سەرچنار . (ئەچیە سەرچنار .)
تۆ شاگیردەکە ئەنێریتە ئەوێ . (ئەنێریە ئەوێ .)

**٢٦٠** . بێ بوونی ئەداتی « ە » و حەرفی « ا » ش ئەتوانرێ لە دوای « ی » و « ێ » کە سی دووەمەوە « ت » بێ وە لە دوای « ا » و « ێ » ی کە سی سێیەمەوە « ت » بێ یان « تین » ێ زیادبکرێ ؛ وەکو ،

ئەگەی . — ئەگەیت . ئەنێری . — ئەنێریت .
ئەچێ . — ئەچێت . — ئەچێتین .
ئەخوا . — ئەخوات . — ئەخواتین .

**٢٦١** . ئەگەر لە دوای « ي » یە وەحەرکەیێ بێتن « ت » بێ ئەخرێتە دوای « ي » یەکەوە بەلام بەپێی § ٢٩ « ي » یەکە فرێ ئەدرێ ؛ وەکو ،

تۆ بیردي . — تۆ بیردتە ماڵەوە . تۆ بیردت ورۆیت .

ئەگەر لە دوایەوە ئەم حرفەش نە بێ ئەتوانرێ لە « ي » یەکە «ت» بێ زیادبیکرێ ؛ وەکو ،

تو ناردي . — تۆ ناردیت .

**٢٦٢** . لە فعلی لازیم و مەجهوولا کەسی سێیەمی تاکی دەمە رابوور- دووەکان بۆناوی پێوە نووساوی باسلێکراویان نیە ؛ وەکو ،

نووست . ئەنووست . بنووستایە .

**٢٦٣** . ئەبینرێ کە بۆناوە پێوە نووساوەکان بۆ هەریەکێ لە کەسەکان چەند چەشنێکیان هەیە ، ئەمانە بەپێی حەرفی دوایی کەلمەکەی پێشانەوەو

[ جەدوەلەکەی § ۲۵۲ ببینە . ] سیغی فعلەکان و دەمەکان دانراوین ،
والەم جەدوەلەی خوارەوەدا پیشان دراوین :

جەدوەلی بۆناوە پێوە نووساوەکان کە ئەبنە پاشلکاو .

| کەس . | هەموو فعلێك . | | لازم و مەجهوول . | | موتەعەددی . | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | لەدەمەکانی ئێستادا . | | لەدە مە رابوردووەکانا | | لەدەمە رابوردووەکانا . | |
| | لەدوای حەرەکەوە . | لەدوای دەنگەوە . | لەدوای حەرەکەوە . | لەدوای دەنگەوە . | لەدوای حەرەکەوە . | لەدوای دەنگەوە . |
| **تـــــــــــاك .** | | | | | | |
| یەکەم . | م . | یم . | م . | یم . | م . | یم . |
| دووەم . | ی ( ـت ). | ی (یت)، ە . | ی(ـت)، ت . | ی ( ـت ) . | ت ( ـت ) . | ي ( یت ) . |
| سێ یەم . | ا ( ات، اتین)، ێ (ێت، ێتین) | | . | . | ی . | ی . |
| **گـــــــــــەل .** | | | | | | |
| یەکەم . | ن . | ین . | لەهەموو دەمێکی لازم و مەجهوول و لە ئێستای موتەعەددیا . | | مان . | |
| دووەم . | ن . | ین . | | | تان . | |
| سێ یەم . | ن . | ین . | | | یان . | |

٢٦٤ . ئەوا لەڕاستەوە بۆچەپ ، لەسەرەوە بۆخوارەوە بەتەرتیبی فعلو دەم وکەس و ژمارە وێنە ئەنوێنین :

مین ئەڕۆم . مین ئەچیم .

تۆ ئەگەی ( ئەگەیت ) . تۆئەچیی ( ئەچیت ) . تۆ بکەوە .

ئەو ئەروا ( ئەڕوات ، ئەڕواتین ) .

ئەو ئەچێ ( ئەچێت ، ئەچێتین ) .

مین‌چەقیم . مین نووستیم .

تۆ چووی ( چوویت ) . تۆ نووستی ( نوستیت ) تۆچەقیت.

مین ئەخۆم . مین‌ئەنووسیم .

تۆ ئەکەی ( ئەکەیت ) . تۆ ئەبری ( ئەبریت ) . تۆ بیگرە .

ئەو ئەخوا ( ئەخوات ، ئەخواتین ) .

ئەو ئەبڕێ ( ئەبڕێت ، ئەبڕێتین ) .

مین هێنام . مین کیردیم . مین‌دۆم خوارد . مین‌دەرزیم خۆ ئێ .

تۆ هێنات . تۆ کیردي ( کیردیت ، کیردیت ) . تۆ دۆت خوارد .

ئەو جووی . ئەو بیردی . ئەو بنێشتی جوو .

ئێمە ئەنووین . ئێمە ئەچمین .

ئێمە چەقین .

ئێوە ئەنوون . ئێوە ئەچین .

ئێوە چەقین . ئێوە نووستین .

ئەوان ئەنوون . ئەوان ئەچین . ئەوان ئەچنە [٠] ماڵەوە .
ئەوان چەقین . ئەوان نووستین .
ئێمە ئەخۆین . ئێمە ئەکڕین .
ئێوە ئەخۆن . ئێوە ئەکڕین .
ئەوان ئەخۆن . ئەوان ئەکڕین .
ئێمە جوومان . ئێمەناردمان . ئێمە بنێشتمان جوو .
ئێوە جووتان . ئێوە ناردتان . ئێوە پیاوتان نارد .
ئەوان ئەیان جوو . ئەوان ناردیان . ئەوان ماسیان ئەخوارد .

## وەزیفەی تەواوکەری

### سەربەخۆ § ١٣٣ .

٢٦٥ . لەکوردیا ئەم بۆناوە پێوە نووساوانە لە بۆناوە سەربەخۆکان زیاتیر وەزیفەی تەواوکەری سەربەخۆیان پێ ئەبەسترێ . بەکەڵک هێنانی بۆناوی سەربەخۆ لەم وەزیفەیەدا بۆ تەئکید ئەبێ یان بۆ نەهێشتینی گومان لە تێگەیشتنا ؛ وەکو ،

ناردمانیم . — مینیان نارد .
ناردمانین .

---

[٠] بەپێی قاعیدە § ٢٩ « ي » ی « ین » فڕێ دراوە .

لەجوملەی یەکە ما « یم » وە لە دووەما « مین » تەواو کەری سەر بە-خۆی فعلی « ناردنان » ن . هەردوو جوملەکە لەمەعنادا فەرقیان نیە . بەلام لە جوملەی دووەما بەکەلك هێنانی بۆناوی « مین » لەباتی « یم » بۆ تەئکیدە . ئەما لە مەعنای جوملەی سێ یە ما گومان هە یە ؛ مەعلووم نیە، « ئێوە مان نارد . » یان « ئەوانمان نارد . » لە بەر ئەوە لە جێ وادا لە باتی بۆناوی پێوە نووساو بۆناوی سەربەخۆ بەکار ئەهێنرێ .

٢٦٦ . بۆناوە پێوە نووساوەکانی « ی ، ي ، ە » ی کەسی دووەم و « ا ، ێ » ی کەسی سێ یەم نابنە تەواو کەری سەربەخۆ .

٢٦٧ . بەپێی قاعدەی § ٢٥٨ ئەتوانرێ لە باتی « ی » ی کەسی دووەم « ت » بەکەلك بهێنرێ ؛ وەکو ،

ئەم نارد یە ماڵەوە . — ئەم ناردتە ماڵەوە .

بیم نارد با یە . — بیم ناردتا یە .

٢٦٨ . شێکلی بۆناوەپێوە نووساوەکان کە ئەبنە تەواو کەری سەربەخۆ بەپێی حەرفی دوایی کەلیمەی پێشانەوەو دەمەکان ئەگۆڕێن . لەم جەدوەلەی خوارەوەدا جێی بەکەلك هێنانمان پیشاندراوە :

جەدوەلی بۆناوە ێنوە نووساوەکان کە ئەبنە تەواوکەری سەربەخۆ .

| کەس . | لەدەمەکانی ئێستادا | | لەدەمە رابور دووەکانا . | |
|---|---|---|---|---|
| | لەدوای حەرەکەوە . | لەدوای دەنگمەوە . | لەدوای حەرەکەوە . | لەدوای دەنگمەوە . |
| **تـــــــــاك .** | | | | |
| یەکەم . | م . | | م (١) . | |
| دووەم . | ت (ب) | | ت (٢)، ی (ىت) . | |
| سێ یەم . | ی (ى § ٣١) . | | . | |
| **گـــــــــەل .** | | | | |
| یەکەم . | مان . | | ىن . | ىمن . |
| دووەم . | تان . | | ن . | ین . |
| سێ یەم . | ىان ( ىمان ) | | ن . | ین . |

---

(١) ئەم « م » ە لەدوای دەنگمەوە ئەبوایە « یم » بوایە . بەلام چونکە لە دەمەرابور دووەکانا هەمیشە لەدوایەوە حەرەکە بێ هەیە « ي » یەکە فڕێ دراوە .

(٢) ئەم « ت » ەش ئەسلەکەی « ي » بووە ، وە چونکە لە دەمە ـ رابور دووەکانا هەمیشە لەدوایەوە حەرەکەیێ ىێت وەکو لە § ٢٦١ دا نووسراوە بووە بە « ت » .

**٢٦٩** . ئەبنری کە شیکلی کەسی دووەم وسێ یەمی گەلی دەمە رابور-
دووەکان لە یەك ئەچین . لەبەر ئەوە ئەگەر لە لێك کیردنەوە یانا گومانێ
بیبێ لەباتیمان بۆ ناوی کەسی سەربەخۆ بە کەلك ئەهێنرێ ( جوملەی سێ
یەمی § ٢٦٢ ببینە . )

**٢٧٠** . بۆ ناوی پێوە نووساوی سێ یەمی تاك لە دەمە رابور دووە کانا
بۆ تەواو کەری سەربەخۆ بەکەلك ناهێنرێ ، ئەگەر لە تێ گەیشتنا گومان
بیبێ بۆ ناوی « ئەو » بەکەلك ئەهێنرێ ؛ وەکو ،

مین ناردیم . — مین ئەویم نارد .

لەجوملەی یەکەما ناتوانرێ بۆ ناوی کەسی پێوە نووساوی « ی » بەکەلك
بهێنرێ .

**٢٧١** . ئەمانەوێنەن بۆ جەدوەلی § ٢٦٧ لەراستەوە بۆ چەپ ، لەسەرە
وە بۆ خوارەوە بە تەرتیبی دەم و کەس و ژمارە :

ئەم نووسیدت . بیم نووسیت .

ئەت ( ت ) نووسیم . بیت ( بیبت ) نووسیم .

ئەی نووسیم . بی نووسیم .

هێنامی . بیت کیردمایە .

نووسیمتیم . ئەم هێنای ( هێنات ) . خواردتیم . بیم خواردبتایە .

ئەمان نووسین . بمان نووسین .

ئەتان نووسەن . بتان نووسەن .

ئەیان نووسیم . بیان نووسیم .

ئەتان دایین . ئەتان بیردەین .

بماندایانایە . ئەتان هێنان . ئەتان بیردین .

## وەزیفەی تەواوکەری بەناربە § ١٣٩ .

**٢٧٢** . لە کوردیدا بۆناوی پێوە نووساو لە بۆناوە سەربەخۆکان زیاتر کاری تەواو کەری بەناربە ئەبینین . بەکەڵك هێنانی بۆناوی سەربەخۆ لەم وەزیفەیەدا بۆ تەئکید ئەبێ یان بۆ نەهێشتینی گومان لە تێگەیشتنا ؛ وەکو ،

پیاوتان لەگەڵ ئەنێریم . — لەگەڵ ئێوە پیاو ئەنێریم .

پیاویم لەگەڵ ناردین .

لەجوملەی یەکەما « لەگەڵتان » وە لە جوملەی دووەما « لەگەڵ ئێوە » تەواوکەری بەناربەی فعلی « ئەنێریم » ین . بەڵام لە جوملەی دووەما بەکەڵك هێنانی بۆناوی « ئێوە » لە باتی « تان » بۆ تەئکیدە . ئەما لە مەعنای جوملەی سێ یەما گومان هەیە ؛ مەعلوم نیە ، « لە گەڵ ئێوە پیاویم نارد . » یان « لەگەڵ ئەوان پیاویم نارد . » لە بەر ئەوە لە جێی وادا لەباتی بۆناوی پێوە نووساو بۆناوی سەربەخۆ بەکار ئەهێنرێ .

**٢٧٣** . بۆناوە پێوە نووساوەکانی « ی ، ە » ی کەسی دووەم و « ا ، ێ » ی کەسی سێ یەم نابنە تەواوکەری بەناربە .

**٢٧٤** . بەپێی قاعیدەی § ٢٥٨ و § ٢٦١ ئەتوانرێ لە باتی « ی » ی کەسی دووەم « یت » وە لەباتی « ي » « ت » یان « یت » بەکەڵك بهێنرێ ؛ وەکو ،

بۆم ناردیە ماڵەوە . — بۆم ناردیتەماڵەوە .

لەسەری ئەکەمەوە . — لەسەرتەکەمەوە .

پیاوي لەگەڵ ئەنێریم . — پیاویت لەگەڵ ئەنێریم .

**٢٧٥** . شیکلی بۆناوەپێوە نووساوەکان کە ئەبنە تەواوکەری بەناربە بەپێی حەرفی دوای کەلیمەکەی پێشانەوە و سینفی فعلەکان و دەمەکان دانراوین ، وا لەم جەدوەلەی خوارەوەدا پیشاندراوین .

جەدوەلی بۆناوە پێوە نووساوەکان کە ئەبنە تەواوکەری بەناربە .

| کەس | هەموو دەمەکانی لازم و مەجهوول وئێستای موتەعەددی . | | رابوردووەکانی موتەعەددی . | |
|---|---|---|---|---|
| | لەدوای حەرەکەوە . | لەدوای دەنگسەوە . | لەدوای حەرەکەوە . | لەدوای دەنگسەوە. |
| **ت______اك** | | | | |
| یەکەم . | م . | یم . | م . | یم . |
| دووەم . | ت ( ب ) . | ي ( یت ) . | ی ( یت ) . | |
| سێیەم . | ي . | | . | |
| **گ______ەل** | | | | |
| یەکەم . | مان . | | ن . | ین . |
| دووەم . | تان . | | ن . | ین . |
| سێیەم . | یان . | | ن . | ین . |

**٢٧٦**. ئەبینرێ کە شیکلی کەسی دووەم و سێیەمی گەلی دەمە رابوردووەکان لەیەك ئەچین . لەبەر ئەوە ئەگەر لە لێك کیردنە وەمانا گومانێ ببێ لە باتیمان بۆ ناوی کەسی سەربەخۆ بەکەڵك ئەهێنرێ : [ جوملەی سێیەمی § ٢٧٢ ببینە . ]

**٢٧٧** . بۆ ناوی پێوە نووساوی سێ یەمی تاك لە دەمە رابور دووەكانی موتەعەددیا بۆ تەواو كەری بە ناربە بەكەلك ناهێنرێ ، ئەگەر لە تێ گەیشتنا گومان ییبێ بۆ ناوی « ئەو » بە كەلك ئەهێنرێ ؛ وەكو ،

بۆم نارد . — بۆ ئەویم نارد .

لەجوملەی یەكەما ناتوانرێ بۆ ناوی پێوە نووساوی«ی» بەكەلك بهێنرێ.

**٢٧٨** . ئەمانە وێنەن بۆ جەدوەلی § ٢٧٥ ، لەراستەوە بوچەپ،لەسەرەوە بۆ خوارەوە بە تەرتیبی فیعل ودەم و كەس و ژمارە :

ئەمەم بۆ بێ . ئەمەم بۆهات . پیاویم لە گەل بهاتایە .

ئەمەت بۆ بێ . ئەمەت بۆهات . پیاویت لە گەل بهاتایە .

ئەمەی بۆ بێ . ئەمەی بۆهات . پیاوی لەگەل بهاتایە .

ئەمەم بۆ بیكرێ . ئەمەت بۆ بیكرێ . پیاوی لە گەل نێررا .

بۆم ئەجووی . لەگەلیم ئەجووی .

بۆت ئەكریم . لە گەلی بچیم . لە گەلیت دەخۆم .

بۆی ئەكریم . لە گەلی ئەچیم .

بۆت دام . بۆت گیرتیم .

بۆم هێنای . بۆم گیرتی . بۆم گیرتمت .

بۆم هێنا . بۆم گیرت .

ئەمەمان لە گەل بێ . پیاومان لە گەل بێ . پیاومان لە گەل هات .

وامان لە گەل ئە كەن . نانمان لە گەل ئەخۆن .

ئەمەتان لەگەل بێ . پیاوتان لە گەل بێ . پیاوتان لە گەل هات .

واتان لە گەل ئەكەن . نانتان لە گەل ئەخۆن .

ئەمەیان لە گەل بێ . پیاویان لەگەل بێ . پیاویان لە گەل هات.

وا مان لە گەڵ ئەکەم . نانمان لە گەڵ ئەخۆم .

ئەوە یان لە گەڵ هێنان . ئەمە یان لە گەڵ کیردەن .

ئەوە مان لە گەڵ هێنان . ئەوەمان لە گە ڵ کیردین .

ئەوە تان لە گەڵ هێنان . ئەوە تان لە گە ڵ کیردین .

## وەزیفەی تەواوکەری ناو § ١٤٣ .

**٢٧٩** . ئەم بۆناوە کورتانە زۆر جار لە باتی بۆناوی سەر بە خۆ بۆ تەواکەری ناو بە کەڵك ئەهێنرێن . بە کەڵك هێنانی بۆ ناوی سەر بە خۆ لەم وەزیفەیە دا بۆ تەئکیدە ؛ وەکو ،

مانگا کەم مرد . — مانگا کەی مین مرد .

لەجوملەی یەکەما «م» و لە جوملەی دووەما « مین » تەواوکەری ناوی « مانگا کە » ن . هەر دوو جوملەکە لەمەعنادا فەرقیان نیە ؛ لە جوملەی دووەما یەکەڵك هێنانی بۆناوی سەربە خۆی « مین » بۆ تەئکیدە .

**٢٨٠** . ئەگەر ئەو بۆ ناوەی ناوەکەی تەواو کیردووە جێی باسلێکراوێکی کیرتیبێ کە لە جوملەکە دا بێژرا بێ ئەبێ هەمیشە بۆ ناوی پێوە نووساو بێ ؛ وەکو ،

مین مانگا کەم مرد .

ژنەکەما نگا کە ی مرد .

ناتوانی بڵێی —

مین مانگای مین مرد .

ژنەکە مانگا کە ی ئەو مرد .

**٢٨١** . بۆناوی کەسی پێوە نووساو بە بێ ئەداتی تەواو ی مەعنای ناو تەواو ئەکەن .

**٢٨٢ .** بۆناوی کەسی پێوە نووساوی « ی ، ئی ، ە » ی کەسی دووەم و « ا ، ێ » ی کەسی سێ یەم نابنە تەواو کەری ناو .

جەدوەلی بۆناوە پێوە نووساوە کان کە ئەبنە تەواو کەری ناو .

| کەس . | ناوەکەلە گەڵ لازم ومەجهوول لەهەرچی وەزنێکابێ وە بۆ موتەعەددی باسلێکراو بێ. لەدوای حەرەکەوە . | ناوەکەلە گەڵ لازم ومەجهوول لەهەرچی وەزنێکابێ وە بۆ موتەعەددی باسلێکراو بێ. لەدوای دەنگەوە . | ناوە کە بۆ موتەعەددی تەواو کەر بێ . ئێستـــا . لەدوای حەرەکەوە. | ناوە کە بۆ موتەعەددی تەواو کەر بێ . ئێستـــا . لەدوای دەنگەوە. | رابـــوردوو . لەدوای هەموو حەرفێکەوە . | | رابـــوردوو . لەدوای حەرەکەوە . | | رابـــوردوو . لەدوای دەنگەوە. |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| **تـــــــاك .** | | | | | | | | | |
| یەکەم . | م . | یم . | م . | یم . | م . | لەدوای ناوەوە بێن | | هەر بۆ سەربەخۆ لەدوای فیعلەوە بێن | یم . |
| دووەم . | ت ( ت ) . | ي ( يت ) . | ت ( ت ) . | ي ( يت ) . | ت . | | | | ت . |
| سێ یەم . | ی . | | ی . | | ی . | | | | . |
| **گـــــــەل .** | | | | | | | | | |
| یەکەم . | مان . | | مان . | | مان . | لەدوای ناوەوە بێن | ن . | هەر بۆ سەربەخۆ لەدوای فیعلەوە بێن | مان . |
| دووەم . | تان . | | تان . | | تان . | | ن . | | ین . |
| سێ یەم . | یان . | | یان . | | یان . | | ن . | | ین . |

**٢٨٣** . لەجە دوەلەکەی سەرەوەدا ئەبینرێ کە ئەو بۆناوە پێوە نووساوەگەلانەی ئەبنە تەواوکەری ئەو ناوانە کەتەواوکەری سەربەخۆن لەدەمە رابوردووە کانا ئەخرێنە دوای ناوەکانەوە یان دوای فعلەکەوە وە بەپێی ئەم جێگایانە وە شیکلیان هەیە . لەبەکەلك هێنانی ئەو شیکلانەی ئەکەونە دوای ناوەوە لەتێگەیشتنا گومان نابێ ، بەلام لە شیکلەکانی دوای فعلا لەمەبانی کەسی دووەم وسێیەما گومان هەیە : وەکو :

کاغەزەکەمانی بیرد . — کاغەزەکەت بیردەن .

کاغەزەکەتانیم بیرد. — کاغەزەکەم بیردین .

کاغەزەکەیانیم بیرد . — کاغەزەکەم بیردین .

دوو جوملەکەی خوارەوەی لای چەپ لەیەك ئەچین . بەلام دوو جوملەکەی لای راستی خوارەوە عەینی مەعنای ئەماندان هەیە ، کەچی لەیەك ناچین .

**٢٨٤** . بەکەلك هێنانی بۆناوە پێوەنووساوەکانی گەلی دوای فعیل بۆتەواوکەری ناوی تەواوکەری بەبار بەجائیز نییە . بۆ ئەمە هەر ئەوانەی ئەکەونە دوای ناوەوەکە « مان ، تان ، یان » ین بەکار ئەهێنرێن .

**٢٨٥** . ئەوا لە راستەوە بۆ چەپ ، لەسەرەوە بۆ خوارەوە بەتەرتیبی فعل و دەم وەکەس وژمارە ووەزیفەوەوێنە ئەنووسین .

کاکەم ئەروا . باوکیم رۆیی . مامۆستام ئەخوا .

کاکەت ئەروا . باوکی رۆیی . مامۆستات خواردی .

کاکەی ئەڕوا . کاکی زۆ نی . ماموستای سەری ئێشێ .

کاکەم ئەبەی . کۆتیرەم ئەگرێ . کۆتیرەم بیگرێ .

کاکەت ئەبەم . کۆتیرەت ئەگرێم . باوکی بانگ ئەکەم .

کاکەی ئەبەم . کۆتیری ئەگرێم . ناوی بنووسێم .

کاکەت هێنام . کۆتیرمی گیرت . کۆتیری گیرتیم .

کاکەتیم هێنا . کۆتیرتیم گیرت . کۆتیرم گیرتمت

کاکەم هێنا . کۆتیرەم گیرت .

کاکەمان ئەبەت . کۆتیرمان ئەگرێ .

کاکەتان ئەبەن . کۆتیرتان بیگرن .

کاکەیان ئەبەن . کۆتیریان ئەگرن .

کاکەمان تان بیرد . کۆتیرمان تان گیرت . ( کاکەتان هێنان . )

کاکەتان مان بیرد . کۆتیرتان مان گیرت . ( کۆتیرمان گیرتین . )

کاکەیان تان بیرد . کۆتیریان تان گیرت . ( کۆتیرتان هێنان . )

لەگەل ماموستای ئەچی . لەگەل باوکیم چووم . لەگەل کاکەت بچیم . لەگەل باوکی دانیم .

لەگەل کاکەم ئەخوینیم . لەگەل باوکیم ئەخوینیم .

لەگەل کاکت ئەخوینیم . لەگەل باوکیت دەخوینیم .

لەگەل کاکەت بخوینیم . لەگەل باوکی بخوینیم .

لەگەل کاکەی بخوینیم . لەگەل باوکی بخوینیم .

لەگەل کاکەتان ئەخوینەن . لەگەل باوکیان ئەخوینەن .

لەگەل کاکەمی خوینند . لەگەل باوکتیم خوینند .

لە گەل کاکەم خوێندب .      لە گەل باوکانی خوێندب .

لە گەل کاکە تانمان خوێندب . لە گەل باوکتانمان خوێندب .

لە گەل کاکە یانیم خوێندب . لە گەل باوکیانیم خوێندب .

## بۆناوی نشانی .

٢٨٦ . بۆناوی نشانی ئەوانەن کە ئشارەتی ناوێك ئەکەن کە لە پێشارا بوردبێ وە جێگاشی ئەگیرنەوە ، ئەشێ ناوە کە بێژرابێ یان لە بەرابێ . بۆناوی نشانی ئەمانەن :

| تاك . | | | |
|---|---|---|---|
| | بۆ ئنسان . | بۆ شیت . | بۆ جێ . |
| بۆ نزیك . | ئەم . ئەمە . | ئەم . ئەمە . | ئەمێ . ئێرە . |
| بۆ دوور . | ئەو . ئەوە . | ئەوە . | ئەوێ . |
| گەل . | | | |
| بۆ نزیك . | ئەمان . ئەمانە . | ئەمانە . | ئێرانە . |
| بۆ دوور . | ئەوان . ئەوانە . | ئەوانە . | ئەو ێمانە . |

## وەزیفەکانی بۆناوی نشانی .

٢٨٧ . بۆناوی نشانی لەوەزیفەکانی ناو پێنجمان ئەبینێ .

٢٨٨ . وەزیفەی باسلێکراوی ؛ وەکو ،

ئەم ترێیە تیرشە ، ئەوە زۆر شیرینە .

ئێرە ناخۆشە ، ئەوێ خۆشە .

کاکیم و باوکیم ئەهاتین ؛ باوکیم هات و ئەو نەهات .

حەماغا چووە مەکتەبەکە مودیرەکە ببینێ ؛ کەچی هەتا ئەو چوو ئەم رۆی بو .

« ئەوە » ی جوملەی چەپی یەکەم و « ئێرە » و « ئەوێ » ی جوملەی راست و چەپی دووەم و « ئەو » ی جوملەی چەپی سێیەم وە « ئەو » و « ئەم » ی جوملەکانی چەپی چوارەم بۆناوی نشانەن وە باسلێکراوین .

ح ٢٨٩ . وەزیفەی تەواوکەری سەربەخۆ ؛ وەکو ،

ئەم کالەکە زەرکە ؛ ئەوە بخۆ .

مین ناگەرێمەوە ؛ ئێرە ئەگرێم بەکرێ .

چووم کە خانەو بەرێراد ببینم ؛ ئەمانیم دی و ئەوانیم نەدی .

« ئەوە » ی جوملەی چەپی یەکەم و « ئێرە » ی جوملەی چەپی دووەم وە « ئەم » و « ئەو » ی جوملەکانی چەپی سێیەم بۆناوی نشانەن وە تەواوکەری سەربەخۆن .

٢٩٠ . وەزیفەی تەواوکەری بەیارنە ؛ وەکو ،

ئەم کالەکانە زەرکین ؛ لەوانە ( لە ئەوانە ) بخۆ .

مین ناچمە چەمچەماڵ ؛ لێرانە ( لە ئێرانە ) دائەنیشم .

ئە ومنالانە نەیان خۆنبووە ؛ لەمان ( لە ئەمان ) بپرسە .

لەم جوملانەدا « لەوانە » ، « لێرانە » و « لەمان » بۆ ناوی نشانەن وە تەواوکەری بەیارنەن .

٢٩١ . وەزیفەی تەواوکەری باسی ناتەواو ؛ وەکو .

کابرا که ئه مه به . ده فته ره که ئه وه به . جێ مین ئه وئسانه به .

**٢٩٢** . وەزنەی ته واو که رێ ناو ؛ وه کو ،

کوڕی ئەم له کوڕی ئه و زه‌تره کتیره .
کیلکی ئه مه له کیلکی ئه وه درێژ تیره .
سێوی ئه وێ له سێوی ئه مێ چا کتیره .

# لێك کرانەوەی بۆ ناوی کەسی وندشانی «ئەو» ، «ئەوە» ، «ئەوێ» .

**٢٩٣** . به کێ لەم بۆناوانه ئه گەر شارەکەی له پێشه وه رابور دیبێ و خۆ شیلەباسلێکراو بێ ئیتوانرێ هەڵ بگەرێ وه له ته واو که ڕ بێ ئیتوانرێ بۆ ناوی کەسی پێوه نووساوی «ی» یله جێ دابینرێ بۆ ناوی که سدمه ، ئه گەر شارەکەی له بەرابێ یان له پێشه وه رابور دیبێ ونه توانرێ هەڵ بگەرێ بۆ ناوی نشانسه ؛ وه کو ،

مناڵه کەم دی ، ئەو زۆر زەره که .
مناڵه که ئه بەمنێم وه ئەو ئه ناسیمەوه .
مناڵه که ئه بەم وه پاره که بۆ ئەو ئەدەم .
مناڵه که بانگ ئه کەم وه گۆچانه کەی ئەو ئه شکێنێم .

لەم جوملانه دا ئه گەر بۆ ناوی « ئەو » جێ « مناڵه که » یان گیرتیبێ و بیتوانرێ هەڵ بگەرێنەوه له ته واو که ر بێ له باتمان بۆ ناوی کەسی «ی» دابینرێ بۆ ناوی که سەن ؛ وه کو ،

منداڵەکەم دڵی ، زۆر زیرەکە .

منداڵەکە ئەبینیم وئەی ناسیمەوە .

منداڵەکە ئەبەم و پارەکەی بۆ ئەدەم .

منداڵەکە بانگ ئەکەم وگۆچانەکەی ئەشکێنیم .

وەئەگەر بەھەڵ گیرتینمان مەقسەد بگوترێ بەعێنی جێ منداڵەکەمان نەگیرتبێتەوە و جێ ناوێکی کەمان کەلە بەرابێ گیرتیبێتەوە بۆناوی نیشانەین .

ئەشێ شارەکە لە پێشا رابوردیبێ کەچی بۆناوەکە نەتوانرێ ھەڵبگیرێ ؛ ئەو ساش نیشانەیە ؛ وەکو ،

پیاوێکیم لەگەڵ منداڵێکادی؛ منداڵەکەم ناسیەوە وئەویم نەناسیەوە.

لە جوملەی « ئەویم نەناسیەوە . » دا « ئەو » جێ « پیاوێك » ئەگرێ ، کەچی ناتوانرێ ھەڵ بگیرێ ؛ لەبەر ئەوە بۆناوی نیشانەیە .

٢٩٤ . ئەم بۆ ناوانە ئەگەر تەواو کەری باسی ناتەواو بین ھەمیشە نیشانەین .

## بۆ ناوی لێکدەر .

٢٩٥ . بۆناوی لێکدەر ئەو بۆ ناوانەن کەجێگای ناوێك ئەگرنەوە کەلە پێشا رابوردیبێ وە دوو جوملەش پێکەوە ئەنووسێنین .

٢٩٦ . بۆناوی لێکدەر ئەمانەن :

کە . ی .

وەکو ،

مین لە خانووەکە کە پار ئێوە کرێتان دانیشتووم .

ب ئەو پیاوەی بێرەدا رابورد ناسیاوم بو .

ئەمانە ئەو منالانەن کە دوێنێ لە ئیمتیحان دەرچون .

لە جوملەی یەکەما دووەم « کە » بۆ ناوی لێکدەرە ؛ چونکە جێی ناوی « خانووەکە » ئەگرێتەوە وە جوملەی « مین لە خانووەکەدا دانیشتووم . » ی بە جوملەی « ئێوە پار کڕیتان . » ەوە نووساندیوە .
لە جوملەی دووەما « ی » ی دوای « ئەو پیاوە » بۆ ناوی لێکدەرە ؛ چونکە جێی « ئەو پیاوە » ئەگرێتەوە وە جوملەی « ئەو پیاوە بێرەدا رابورد . » ی بە جوملەی « ئەو پیاوە ناسیاوم بو . » وەوە نووساندیوە . لە جوملەی سێیەما « کە » ی دوای « ئەو منالانەن . » بۆ ناوی لێکدەرە ؛ چونکە جێی « ئەو منالانە » ئەگرێتەوەوە جوملەی « ئەمانە ئەو منالانەن . » ی بە جوملەی « ئەو منالانە دوێنێ لە ئیمتیحان دەرچون » ەوە نووساندیوە .

٢٩٧ . شاری بۆ ناوی لێکدەرە گەلێ جار ئەبێ ئەداتێکی تەعریف یا سفەتێکی نیشانی یان موبهەمی لە تەکا بێ ؛ وەکو ،

پارە بێ کە تۆ هەتە بەشی ئەمە نا کا .

پیاوەکە کە کتێبی ئەخوێند مامۆستام بو .

ئەو پیاوەی کارکەر بێ ڕەحەتی ئەبینێ .

هەندێ منال کەلێرە ن نافامین .

منالە کانکەش کەنە یان ئەتوانی ئیمتیحان بدەن هاتیبون .

## جێگای بۆ ناوی لێکدەر .

٢٩٨ . هەر دوو بۆ ناوەکە لە کارا فەرقیان نیە . بەڵام بۆ ناوی « ی » جێی ناوێ ئەگرێتەوە کە حەرفی تەعریفی مەعهەن یان سفەتی نیشانی لە تەکا

بێ وە ڕاستەو خۆ لە پاش شارەکەوە بێ ؛ وەکو ،

ـــــ ئ باخەکەی تۆ دی بوتب هی منە .

ئەو باخەی تۆ دی بوتب هی منە .

**٢٩٩** . بۆناوی « کە » هەم لە پاش ناوەکەوە — ئەداتی تەعریف ، سفەتی نیشانی و موبهەمی لە تەکابێ و نەبێ — ، هەم لە مەعانی دوو جوملە-کەدا ئەتوانرێ بە کەڵك بهێنرێ ؛ وەکو ،

سولفاتەکە تالە بۆ لەرزوتا بەکاو نەکە .

سەلاحەددین کە دینمای گیرت لە کوردی ئالی بابان بو .

( شێخ ڕەزا . )

تۆکە نەخۆشی ناتوانی بڕۆی .

ئەو پیاوە ڕەحەتی ئەبینێ کە کارکەر بێ .

مین لە خانووەکەدا دانیشتووم کە ئێوە پار کڕیبوتان .

تەماشای وێنەکانی § ٢٩٧ ش بکە ؛

**٣٠٠** . ئەگەر لەپاش شارەکەوە بۆناوێکی کەسی پێوە نووساو بیبێ « کە » بەکەڵك ئەهێنرێ ؛ وەکو ،

کام منالی کاکي زیرەکە ؟ — ئەو منالەی کە ئێستا لێرە بو زیرەکە .

لە جوملەکەی لای چەپا بۆناوی « ی » بۆناوی کەسی پێوە نووساوە وە جێی ناوی « کاکي » ئەگرێتەوە وە تەواوکەری ناوی « منال » ە .

وێنەی تیر :

ئەو منالەم کە ئەمرۆ دەست زۆر تێ ئەکۆشێ .

ئەو منالەیان کە تێ ناکۆشێ کەم زانیستە .

# رێك کەوتینی بۆناوی لێکدەر لەگەڵ شارەکەدا .

١/٣٠١ . بۆناوی لێکدەر هەر چەندە خۆی گەل نا گرێتەوە بەڵام لەژمارە ولەکەسا هەمیشە وەکو شارەکەی ئەژمێررێ ؛ وەکو ،

ئەو منالەی هاتە ئێرە ناوی دارا یە .

ئەو منالانەی هاتنە ئێرە زیرەکین .

ئێوە کە هیچ نازانین مەیێنە پێشەوە .

لە جوملەی یەکەما بۆ ناوی « ی » باسلێکراوی فعلی « هات . » ە ، بە تاك ئەژمێررێ ؛ چونکە شارەکەی کە « ئەو منالە » یە تاکە ، لە بەر ئەوە فعلەکەی تاکە لە جوملەی دووەما بۆناوی « ی » باسلێکراوی فعلی « هاتین . » ە ، بە گەل ئەژمێررێ ؛ چونکە شارەکەی کە « ئەو منالانە » ـ یە گەلە ، لە بەر ئەوە فعلەکەی گەلە . لە جوملەی سێیەما بۆناوی « کە » باسلێکراوی فعلی « نازانین . » ە ، بە گەل ئەژمێررێ ؛ چونکە شارەـ کەی کە « ئێوە » یە گەلە ، لە بەر ئەوە فعلەکەی گەلە .

# بۆناوی موبهەم .

٣٠٢ . بۆ ناوی موبهەم ئەوانەن کە جێی کەسێ یان شتێك بە تایبەتی ناگیرنەوە ، ئەمانە شاریان دیار نابێ ؛ وەکو ،

یەکێ لە دەرگا ئەدا .

لێرە دا « یەکێ » جێی کەسێ ئەگرێتەوە ، وە لێ ئەو کەسە بە مەعنەنی دیار نیە کە کێیە . لە بەر ئەمە بۆ ناوی موبهەمە .

٣٠٣ . ئەمانە بۆناوی موبهەمین :

| بۆناوی موبهەمی ڕووت . | | بۆناوی موبهەمی لێکدراو . | |
|---|---|---|---|
| کەس . | کام . | کەسێ . | هەنێ . |
| پیاو . | چی . | هیچکەس . | هەنە کە . |
| هیچ . | کابرا . | هەرکەسێ . | کابرایێ . |
| یەک . | فلان . | هەچکەسێ . | کابرا کە . |
| کێ . | هەموو . | هەموو کەسێ . | هەرکابرایێ . |
| هەن . | زۆر . | یەکتێر . | هەندێ . |
| کەم . | | پیاوێ . | گەلێ . |
| | | نەختێ . | فلانە کەس . |

## وەزیفەکانی بۆناوی موبهەم .

٣٠٤ . بۆناوی موبهەم پێنج وەزیفەی هەیە .

٣٠٥ . وەزیفەی باسلێکراوێ ؛ وەکو ،
کەس بێرەدا ڕانەبورد .

٣٠٦ . وەزیفەی تەواوکەری سەر بە خۆ ؛ وەکو ،
ئایا تۆ هەن ئەناسی ؟

٣٠٧ . وەزیفەی تەواوکەری بە ناربە ؛ وەکو ،
مین بە کابرام ووت .

٣٠٨ . ئەمانە ئەتوانین بیبنە تەواوکەری باسی ناتەواو :
یەکێ . کابرا . فلانە کەس .
هەن . فلان .

وەکو ،

خولە بەکنکە لەوان .

ئەمە کابرابە .

٣٠٩ . وەزسفەی تەواو کەری ناو ؛ وەکو ،

ئەمە بارەی کە سمان ناوێ .

٣١٠ . هەندێ جار باسلنکراوی فعلنکی کەسی سێ یەمی گەل هەلـ ئەگەرێ و بۆناوە پێوە نووساوەکەی بە بۆناوێکی موبهەم ئەعتبار ئەکرێ ؛ وەکو ،

ئەلێن ئەرز خرە .

٣١١ . لەم بۆناوانە ئەوانەی لەجەدوەلی سفەتی موبهەما بەنراوین، ئەگەر لەوەزسفەی باسلنکراوی و تەواو کەری سەربەخۆ ، بەبارەوە لەتەواو کەری ناوا بەتەنیا بەکەلك بهێنرێن ، بۆناوین وە ئەگەر ناوێ یان بۆناوێ تەواو بکەن سفەتین . « هەمن » ش ، ئەگەر ناوێ یان بۆناوێ تەواو بکا ، سفەتە ؛ وەکو ،

هەموو هاتین . هەموو منالەکان هاتین .

هەمن هات . مین منالی هەمنیم ناوێ .

لە جوملەکانی لای راستا « هەموو » ، « هەمن » بۆناوی موبهەمین ، لەوانەی لای چەپا سفەتی موبهەمین . لەگەل ئەمەشا مومکننە لێرەدا « هەمن » بۆناوبێ ، ئەگەر مەقسەد لەو « منال » ە بێ کە هی « هەمن » بێ .

## بۆناوی پرسی .

٣١٢ . بۆ ناوی پرسی ئەو بۆ ناوانەن کە پرس ئەکەن ، لە بەر ئەم خاسەیە تەیان پێ یان ئەلێن کە بۆ ناوێکن کە لە شوێن شارەکەیان ئەگەڕێن ؛ وەکو ،

کێ هات ؟

٣١٣ . بۆ ناوی پرسی ئەمانەن :

| بۆ ئنسان . | بۆ شیت . | بۆ جێ . |
|---|---|---|
| کێ ؟ | چی ؟ | کوێ ؟ |
| چەند ؟ | چەند ؟ | |
| کام ؟ | کامە ( کام ) ؟ | |

## وەزیفەکانی بۆناوی پرسی

٣١٤ . بۆ ناوی پرسی پێنج وەزیفەی هەیە .

٣١٥ . وەزیفەی باسلێکراوی ؛ وەکو ،

کێ هات ؟

٣١٦ . وەزیفەی تەواوکەری سەربەخۆ ؛ وەکو ،

چەندیت دەوێ ؟

٣١٧ . وەزیفەی تەواوکەری بەیارنە ؛ وەکو ،

بەچیت گیرت ؟

٣١٨ . ئەمانە ئەتوانین ببنە تەواوکەری باسی ناتەواو .

کێ ؟ کوێ ؟

وەکو ،

ئەمە کێ یە ؟ ئەوە کوێیە ؟

**٣١٩** . وەزیفەی تەواو کەری ناو ؛ وەکو ،

ترێی کوێ خۆشە ؟

« چەند ؟ » نابێتە تەواو کەری ناو .

**٣٢٠** . « چەند ؟ » ، « کام ؟ » ، « چی ؟ » ئەگەر تەواو کەری ناو یان هی باسی ناتەواو نەبێن بۆ ناوێن وە ئەگەر ناوێ تەواو بکەن یان تەواو کەری باسی ناتەواو بێن سفەتێن ؛ وەکو ،

چەند یان هاتێن؟ — چەند منداڵ هات ؟

کامیان هات ؟ — منداڵەکە کامە ؟

چی لە بەر ئەکەی ؟ — ئەم کەوا بەچیە ؟

لەم جوملانەدا « چەند ؟ کام ؟ چی ؟ »ی لای ڕاست بۆ ناوی پێرسینن، ئەوانەی لای چەپ سفەتی پێرسینن .

**٣٢١** . « چی ؟ » ئەگەر ناوێکی تەواو کیردیبێ بەپێی مەقسەدە وە بۆ ناویش ئەبێ و سفەتیش .

## بۆ ناوی خۆیی .

**٣٢٢** . بۆ ناوی خۆیی بۆ ناوێکی لێکدراوە وە بۆ تە ئکسیدی کەسەکان یان بۆ هی ناو بەکەڵك ئەهێنرێن . ئەمانە لەکەلیمەی «خۆ» وە بۆ ناوی پێوە نووساوی « م ، ت ، ی ، مان ، تان ، یان . » دوروست بوون ؛ ئەمانەن :

| | | |
|---|---|---|
| کەس . | تاك . | گەل . |
| یەکەم . | خۆم . | خۆمان . |
| دووەم . | خۆت . | خۆتان . |
| سێ یەم . | خۆی . | خۆیان . |

## وەزسفەکانی بۆناوی خۆیی .

٣٢٣ . بۆ ناوی خۆیی پێنج وەزسفەی هەیە .

٣٢٤ . وەزسفەی باسانێکراوی ؛ وەکو ،

مین خۆم ئەچیم . مین خۆم ئەی خوم .

٣٢٥ . وەزسفەی تەواوکەری سەربەخۆ ؛ وەکو ،

مین خۆم ئەسووتێنم . مین خۆی ئەنێریم .

٣٢٦ . وەزسفەی تەواوکەری بەیاریە ؛ وەکو ،

مین لە خۆم ئەدەم مین لە خۆی ئەدەم .

٣٢٧ . وەزسفەی تەواوکەری بامی ناتەواو ؛ وەکو ،

ئەمە خۆمیم . ئەوە خۆتی .

٣٢٨ . وەزسفەی تەواوکەری ناو ؛ وەکو ،

خوامراد پیاوی خۆی ئەنێرێتە ئێرە .

٣٢٩ . ئەم بۆناوانە بۆناوی تەئکیدیشیان پێ ئەلێن .

## بۆناوی کەسی میلکی .

٣٣٠ . بۆناوی کەسی میلکی ئەو بۆناوانەن کە جێی ناوێ بەپێ- دانی فیکرێکی میلکانە ئەمە وە ئەگرن ، ئەمانەش بۆ ناوی لێکبراوین وە کە ئەمەی « هی » و بۆناوێکی سەربەخۆیان خۆی دوروست ئەبین وە ئەمانەن :

| کەس . | تاك . | گەل . |
|---|---|---|
| یەکەم . | هی مین . هی خۆم . | هی ئێمە . هی خۆمان . |
| دووەم . | هی تۆ . هی خۆت . | هی ئێوە . هی خۆتان . |
| سێیەم . | هی ئەو . هی خۆی . | هی ئەوان . هی خۆیان . |

٣٣١ . لە باتی بۆناوی سەربەخۆی کەسی سێیەم ئەتوانرێ ناویان بۆناوێکی نشانی ، موبهەم وەیا پیرسی بەکەلك بهێنرێ ؛ وەکو ،

هی خانوو . هی منالەکان . هی ئەمانە . هی هەندێکیان .

هی کێ ؟

## وەزیفەکانی بۆناوی میلکی .

٣٣٢ . بۆناوی میلکی پێنج وەزیفەی هەیە .

٣٣٣ . وەزیفەی باسلێکراوی ؛ وەکو ،

هی مین خوێندی .

٣٣٤ . وەزیفەی تەواوکەری سەربەخۆ ، وەکو ،

هی خۆیانیم بانگ کیرد .

٣٣٥ . وەزیفەی تەواوکەری بەیارنە ؛ وەکو ،

لەهی منالەکان ئەگێرمەوە .

٣٣٦ . وەزیفەی تەواوکەری باسی ناتەواو ؛ وەکو ،

ئەم منالە هی ئەوە .

٣٣٧ . وەزیفەی تەواوکەری ناو ؛ وەکو ،

هی کێ هات ؟